

به به‌کارهێنانی لێهاتووییه‌کانی NLP

# چۆن هاوڕێکانت هه‌ڵده‌بژێریت؟



عبدالرحمن الصباغ



# چۆن هاوڕێکانت هەڵدەبژێریت؟

به بەکارهێنانی لێهاتووییەکانی پڕۆگرامسازیی زمانەوانی دەماری NLP

عبدالرحمن الصباغ



ناوی کتێب: چۆن هاوڕێکانت هەڵدەبژێریت؟

نووسینی: ڕاهێنەر (عبدالرحمن الصباغ)

وەرگێڕانی: تارق نەجیب ڕەشید

پێداچوونەوەی: بەفراو جەمال

نۆبەی چاپ: یەکەم - ٢٠١٤

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (١٧١١)ی ساڵی٢٠١٢ی پێ دراوە

# پێشەکی



بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سوپاس و ستایش بۆ ئەو پەروەردگارەی مرۆڤەکانی کردووەتە گەل و نەتەوە و هۆزی جیاجیا تا ئەم جیاوازانە یەکتر بناسن و پێکەوە بژین، سوپاسی ئەو خوایە دەکەین کە بە جۆراوجۆری و فرەچەشنی مرۆڤەکانی بەدیهێناوە، وەك لاواز و بەهێز، هەژار و دەوڵەمەند، سەرباز و سەرکردە، نەزان و زانا.

درود و سڵاوی پەروەردگار لەسەر موحەمەدی مامۆستای مرۆڤایەتی ﷺ، کە خۆی و هاوەڵەکانی فێری واتای هاوڕێیەتییان کردین و، فێری واتای دڵسۆزبوونیان کردین بۆ ئەم هاوڕێیەتییە، ئەوەتا ئەمڕۆ وشەی (هاوڕێ) لەبری وشەی (برادەر) بەکاردێنن، کە لە ڕابردوودا بەکاردەهات، کەواتە برادەرەکانی پێغەمبەری خوا بریتی بوون لە کۆمەڵە هاوڕێیەکی دڵسۆزی وەفادار بۆ پێغەمبەرەکەیان ﷺ، ناونانی پەیوەندییەکانیش تەنها کۆمەڵە ناوێکن کە جۆری ئەو پەیوەندییە پێناسەدەکەن کە لە نێوانیاندا هەبووە.

بەڕاستی من ناتوانم وێنەی ژیانێك بێنمە پێشچاو بەبێ هـاوڕێ و، تـەواوی مرۆڤـەکانیش پشـتیوانی ئـەم بۆچـوونەم دەکـەن؛ چـونکە هاوڕێیـــەتی بەهایـــەکی جـــوان و چێژبەخشـــە و، پێویســـتییەکی بەردەوامبوونی ژیانە بەشێوە سروشتییەکەی، هاوڕێکان ئەوانـەن کـە تۆ خەم و گرفـت و خولیاکـانی خۆتیـان بـۆ بـاس دەکـەیت، تەنانـەت کاتێك بیروباوەڕەکانت لەگەڵ باوکت ناکۆك و ناتەبا دەبن و، نـاکۆکی دەکەوێتە نێوانتان، هەندێ کـات باوکـت ناچـار دەبێـت لەبەرامبەرتـدا دەسەڵاتی خۆی بەکاربهێنێت بۆ نموونە هەڕەشەی بڕینی مانگانە یان ڕۆژانەکەت لێدەکات ئەگەر وەڵامی نەدەیتـەوە و گوێڕایـەڵی نەکـەیت، هەنـدێ جـاریش نایـەڵێت بـرا و خوشـکەکانت قسـەت لەگـەڵ بکـەن، بۆئەوەی لە کۆمەڵ و دەورووبەر دابتبڕێت.



لەکاتی لەم جۆرەدا ڕوو لە کێ دەکەیت تا خەم و خەفەت و گرفتەکانتی بۆ باسبکەیت؟ ئایا ڕوو لە یەکێك لە هاوڕێ دڵسۆزەکانت ناکەیت؟ بەڵێ، دەچیت ئەوەی لە ناختدایە بۆی هەڵدەڕێژێت... کاتێکیش ئامانجی خۆت لە ژیاندا دیاریدەکەیت و سووریت لەسەرئەوەی کە بچیتە کۆلێژی یاسا، بۆئەوەی لەوێوەوە قۆناغی خوێندنی باڵا تەواو بکەیت، دواتریش ببیتە یەکێك لە دادوەرەکان، ئایا ناچیت بۆ لای هاوڕێکەت تا ئەمەی بەبیرتاهاتووە بۆی باس بکەیت؟

بەم شێوەیە تۆ خواست و ئامانج و پرۆژەکانت بۆ هاوڕێکەت باس دەکەیت و، خەم و گرفتەکانیشت هەر لای ئەو دەدرکێنیت و... هتد.

ئایا چەند جار ڕۆیشتویت بۆ لای یەکێك لە هاوڕێ خۆشەویستەکانت و باسی خەمەکانی خۆت لای ئەو کردووە و، ئەویش هاوکاری و پشتیوانی کردوویت؟!.

بەڵام لە یادت بێت، لە کۆتاییدا هاوڕێکانیش کۆمەڵێك کەسی گۆڕاون و، هەریەکێك لەوان ژیانێکی تایبەت بە خۆی دەبێت لە ئایندەدا، هاوسەر دەگرێت و دەبێتە خاوەنی ماڵ و منداڵ، ئەو کاتە ساڵی یەك جاریش نایبینیتەوە و، ئەو هاوڕێیەی لەکاتی ڕەبەنی و لاویدا قەرزی پێدەدایت، دەگونجێت ئیتر ئامادەنەبێت قەرزت بداتێ،

لەکاتێکدا کە گیرفانەکانی پڕن لە پارە و کاری سەربەخۆ و دەستەی کاریشی هەیە!

دەشگونجێت هەندێکی تر لە هاوڕێکانت پارە و سامانی زۆریان نەبێت و، مووچەخۆری ئاسایی بن، بەڵام هەر ئامادە نەبن قەرزت بدەنێ لەبەر دەستکورتیان.

لەبەرئەوە پێویست ناکات هاوڕێکانت بکەیتە تەوەرەیەکی سەرەکی لە ژیانتدا؛ چونکە ناتوانیت ئایندەی خۆت بە پشتبەستن بەوان بوونیاد بنێیت، بەڵکو بە هەموو توانایەکتەوە هەوڵبدە پارێزگاری لە ڕایەڵەی پەیوەندییەکان بکەیت لەنێوان خۆت و ئەواندا، لەم پێناوەشدا هەر دەرفەتێکت هەبوو دەعوەتیان بکەیت بۆ نانخواردن لە دەستی مەدە. ئەوەش بزانە کە هەموو هاوڕێکان بەوشێوەیە خراپ نین، بەڵام ئەوە سروشتی ژیانە کە هەموو ساڵێك و هەموو قۆناغێك بەهەمان سیستمی بەرنامەبۆداڕێژراو تێدەپەڕێت لەگەڵ هەمەچەشنی و گۆڕانی لەناکاو کە بەسەریدا دێت. گەورەترین بەڵگە لەسەر ئەمە بریتییە لە تیۆری کۆمەڵایەتی، کە تیۆری فرمانیشی پێ دەوترێت، ئەم تیۆرە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەریەکێك لە ئێمە فرمانێکی هەیە لەم گەردوونەدا و، پێویستە لەبەرامبەردا مرۆڤی خراپەکار و چاکەکار و... هتد بوونیان هەبێت، سەرەنجام خوای گەورە ڕێنمایی هەریەك لە ئێمەی کردووە و، ڕێگەی

چاکه و خراپەی نیشانداوین و، هەر خۆمان بڕیار دەدەین کام ڕێگەیان هەڵبژێرین، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ﴾ البلد:١٠. واته: (یا ڕێگای چاکەو خراپەمان پیشان داوه تا چاکه بکاو خراپه نەکا). ئەوەش بزانه زۆرێك له هاوڕێیان پشتیوانیت لێدەکەن و شانبەشانت دەوەستن، بەڵام هەمیشه ئەوەت لەیادبێت که چۆن بەردەوام هاوڕێی دڵسۆز و بەوەفا و میهرەبان و ئامۆژگاریکار هەیە.... بەهەمان شێوه لەبەرامبەردا هاوڕێی ناپاك و ڕەوشت نزم و بێ وەفا و...هتد هەیە.




واتای زۆری هەیە:

١- جارێك بە واتای (الخلة - دۆست) هاتووە، زۆرجا بە چەند هاوڕێیەك دەوترێت: (دۆستی یەكترن)، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (المرء على دين خليله) واتە: "مرۆڤ لەسەر ئایینی دۆستەكەیەتی".[١]

٢- الصحبة: (ئەبو عوبەید) دەربارەی دۆست دەڵێت: "بەهۆی دۆستایەتییەوە گوێڕایەڵی كەسەكە بوویت، بوویتە دۆستی، واتە بەگوێت كرد، هەروەها دۆست بە واتای مامەڵە لەگەڵدا كردن دێت، دۆست وشەیەكی تاكە، وشەی دۆستان كۆكەیەتی، وەك: لاو و لاوان".

لە كتێبی (الفروق في اللغة)ی ئەبو هیلالی عەسكەریدا هاتووە كە: "هاوڕێیەتی واتە: ڕێكەوتنی ویژدانەكان لەسەر خۆشەویستی".

---

١- المستدرك على الصحيحين للحاكم، حديث: ٧٣٨٧.

٣- الصداقة: هاوڕێیەتی لە ڕاستگۆییەوە سەرچاوە دەگرێت، کە پێچەوانەی درۆکردنە، بەمشێوەیە هاوڕێیەتی دەبێتە ڕاستگۆیی لە ئامۆژگاریکردن و برایەتیدا.

لە قورئانی پیرۆزدا لە بەرامبەر هاوڕێیەتیدا وشەی (برایەتی) بەکارهاتووە بۆ ئەو کەسانەی شوێنکەوتەی هەمان بیروباوەڕن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ الحجرات:١٠، واتە: (ئەوانەی ئیمانیان بە خواو بە پێغەمبەری خوا هەیە برای یەکەن)، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: (والله في عون العبد ما كان العبد في عون أخيه) واتە: "خوای گەورە بەردەوام لە هاوکاریکردنی بەندەیەکیدایە، کە ئەو بەندەیە لە هاوکاریکردنی براکەیدا بێت".[١]

هەروەها لە کتێبی (الأدب الكبير)ی (ئیبنول موقەفەع)دا هاتووە کە دەڵێت: "برایانی ڕاستەقینە باشترین دەستکەوتەکانی دنیان، ئەوان دیمەنی قەشەنگیی و خۆشگوزەرانی و توێشووی تەنگانەن، هاوکارن بۆ دنیا و قیامەت، لەبەرئەوە کەمتەرخەمی مەکەن لە بەدەستخستنی ئەم جۆرە هاوڕێیانە و، گرتنەبەری ئەو ڕێگە و هۆکارانەی کە دەتانگەیەنێتە ئەم هاوڕێیانە".

---

١- صحيح المسلم، حديث: ٤٩٧٣



# چەمکی هاوڕێیەتی:



هاوڕێیەتی بریتییە لە سۆزێکی دوولایەنە لەنێوان دوو کەسدا کە هەریەکەیان چاکەی بەرامبەرەکەی دەوێت، لەگەڵ ئاگاداربوونی هەردوو هاوڕێکە بەم سۆزەیان.

هاوڕێ بریتییە لەو کەسەی بە چەشنێك هاوژیانیت دەکات، کە خۆشییەکانت دڵخۆشی دەکەن و، پەژارەکانت خەمباری دەکەن، بەمشێوەیە پەیوەندی هاوڕێیەتی لەسەر بناغەی پێکەوە ژیان و لەیەکچوون و هاوبەشیی ویژدانیی دەبەسترێت.

هاوڕێیەتی بەتەنها لە نێوان تاکەکان و کەسەکاندا پێکنایەت، بەڵکو لەنێوان گەل و نەتەوە و دەوڵەت و ڕێکخراو و شارەکانیشدا پێکدێت.

هاوڕێیەتی یەکێکە لە پێداویستییە گرنگەکانی ژیان؛ چونکە هیچ کەسێك بێ هاوڕێ ناتوانێت بژی، با خاوەنی هەموو هۆکارەکانی خۆشگوزەرانیش بێت، لەڕاستیدا هاوڕێیان ئەو قەڵا و پشتیوانە پتەوەن کە لە کاتی ناخۆشی و سەختییەکاندا پەنایان بۆدەبەین.

هاوڕێیەتی پێویستییەکی بنەڕەتییە بۆ لاوان؛ چونکە هاوڕێ ئامۆژگاری هاوڕێکەی دەکات و لە پێ هەڵخلیسکان دەیپارێزێت، لەهەمان کاتدا بۆ پیر و بەساڵاچووش گرنگە؛ چونکە لەکاتی بەساڵاچوون و لاوازبوونی جەستەیدا هاوکاری دەکات و پشتیوانی دەبێت.

لەم بارەیەوە (ئەرستۆ) وتەیەکی جوانی هەیە کە دەڵێت: "هەرکاتێ هەندێك لە خەڵکی ئەوانی دیکەیان خۆشویست، ئەوە هیچ پێویست بە بوونی دادپەروەری ناکات، بەڵام (خەڵکی) هەرچەندە دادپەروەریش بن ناتوانن دەستبەرداری هاوڕێیەتی ببن".

هەروەها وتراوە: "هەرکەس هاوڕێکانی زۆربوون، ئەوە هاوڕێی ڕاستەقینەی نییە"، چونکە مرۆڤ ناتوانێت پارێزگاری لە ژمارەیەکی زۆر هاوڕێ و پەیوەندی هاوڕێیەتی بکات، ئەمەش لەبەرئەوەی هاوڕێیەتی پێویستی بە قوربانیدان و بایەخپێدان هەیە.



## لە ڕووکارەکانی هاوڕێیەتی:



### ١- کۆمەکیی و پشتیوانی کردن:

حەزرەتی مووسا (سەلامی خوای لێ بێ) داوای لە پەروەردگار کرد کە (هاروون) بکاتە پشتیوان و کۆمەککاری وەك دەفەرموێت: ﴿وَاجْعَل لِّي وَزِيراً مِّنْ أَهْلِي* هَارُونَ أَخِي* اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي* وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي﴾، واتە: (وەزیرێکیشم لە کەسوکاری خۆم بۆ دانێ یارمەتیم بدا لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی سەرشانما. هاروونی برام بێ. پشتمی پێبگرە و پێی بەهێز بکە. بیشیکە بە هاوبەشم لەم کاری پێغەمبەرێتییەما بۆ سەر فیرعەون.).

ئەمە بریتییە لە هەڵوێستی هاوڕێ دڵسۆزەکان کە بەردەوام پشتیوان و کۆمەککارن، ئەوەتا هاوڕێیانی پێغەمبەر ﷺ بە پێغەمبەریان وت: "سوێند بەخوا، ئەگەر بمانبەیتە نێو دەریاکانەوە ئەوە لەگەڵ تۆدا دێین و دەریاکان دەبڕین".

### ٢- ڕێنمایی و ئاڕاستەکردن:

ڕێنمایی و ئامۆژگاریکردن لە سیستمی ئیسلامدا کارێکی گرنگە بۆ هەمووان، هەر لە سەرۆك و بەرپرسانەوە تا هاوڵاتیانی ئاسایی و،

مامۆستایان و، باوك و دایكان و، هاوڕێیان؛ لەبەرئەوە ئەركی هاوڕێیان ئامۆژگاریكردنی یەكترە بەبێ ئەوەی ئەم ئامۆژگارییە سروشتی پەیوەندی هاوڕێیەتی نێوانیان بشێوێنێت.



## هاوڕێیەتی لەڕوانگەی تێگەیشتنی ئیسلامیەوە:



هاوڕێیەتی لە ئایینی ئیسلامدا چەندین ناوی لێ نراوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گشتگیری ئیسلام و گرنگیدانی بە پێكهێنانی پەیوەندییەكان، تەنانەت گرنگی دان و هاندانیشی لەپێناو بەهێزكردنی ئەم پەیوەندییانە، ئەمەش بە توندوتۆڵكردنی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان لەنێو خەڵكیدا بە هەموو چین و توێژ و بیروباوەڕە جیاواز و، ڕۆشنبیری و زانستە جیاوازەكانیانەوە.

دەبینین جارێك ئەم پەیوەندییە بە (برایەتی) وەسف دەكات و، جارێكی تر بە (دۆستایەتی) و جارێكی تر بە (هاوڕێیەتی) دەیناسێنێت. بناغەی ئیسلام لەسەر بنەمای بڕوابوون بە فرەچەشنی و فرەڕەنگی خەڵكی و، كۆكردنەوەی هەمووان لە ژێر سایەی یەك كۆمەڵگەدا دامەزراوە، بۆ ڕوانینە هیچ جیاوازییەك جگە لە تەقوا و

چاکەکاری، واتە فرەچەشنی و فرەیی ناو و ناونیشانەکان پێوەرنین بۆ جیاوازبوون، لەکاتێکدا کەسەکان هەڵگری بیرکردنەوەی ڕاست و قەشەنگ و سوودبەخش بن.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لا فضل لعربي على عجمي ولا لعجمي على عربي، ولا أحمر على أسود، ولا أسود على أحمر، إلا بالتقوى أبلغت) واتە: "هیچ ڕێزێکی زیادە نییە بۆ عەرەبێك بەسەر عەجەمێکدا [1]، یا عەجەمێك بەسەر عەرەبێکدا، یا سوور پێستێ بەسەر ڕەش پێستێکەوە، یا ڕەش پێستێك بەسەر سوور پێستێکەوە تەنها بە لە خواترسان و چاکەکردن نەبێت". [2]

هەروەها دەفەرموێت: (لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه مايحب لنفسه) واتە: "هەر کەسێك لە ئێوە ئیمانی تەواو و کامڵ نابێت، تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ برا موسوڵمانەکەیشی پێی خۆش بێت". [3]

---

١- عەجەم: بە هەموو نەتەوەیەکی تر دەوترێت جگە لە عەرەب.

٢- مسند أحمد بن حنبل، حديث: ٢٢٨٦٤

[3]- صحيح البخاري، حديث: ١٣

## یەکێتی بیروباوەڕ:

لـە گرنگییـە سـەرەتایی و بنەڕەتییـەکانی هاوڕێیـەتی یـەکێتی بیروبـاوەڕ و بۆچـوونەکانە، ئـەم بابەتـە هۆکـارێکی گرنگـە بـۆ بـەهێزکردنی پەیوەندییـە دوولایەنـەکانی خۆشەویسـتی و، پشـتیوانی لەیەکترکردن و، بوونیادنان و، گەشەپێدانی مرۆیی و... هتد.

## جیاوازی لە بیروباوەڕدا:

هاوڕێیەتی لە ڕوانگەی ئایینی ئیسلامەوە لەسـەر هاوبیروبـاوەڕی بونیاددەنرێـت، لـە کۆمەڵگەیەکیشـدا کـە هـەموویان هـەڵگری یـەك بیروباوەڕ نەبوون، دەبینیت هاوڕێیەتی لەنێوان ئەو کەسانەی هەڵگری بیروباوەڕی ئیسلامیین و ئەوانەی تردا کە بیروباوەڕی جیاوازیان هەیە دروست دەبێت و، هەموویان پێکەوە دەبنە یەکدەست و یـەك گـروپ لەنێو کۆمەڵگەیەکی زۆرینە یەکتاپەرستدا. بەم شێوەیە جیاوازی نییە لەنێوان موسـڵمانێك و کەسـێکی تـردا لـە دۆسـتایەتی و هاوڕێیـەتی و پێکەوە ژیاندا، یاخود لە هاوڵاتیبوونـدا؛ ڕاسـتی ئـەم بۆچـوونەش لـە قورئانی پـیرۆزدا دەبیـنین، کاتێـك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ العنكبـوت:٤٦، واتـە: (دەمەقاڵە مەکەن لەگەڵ کەسانی سەر بەو ئایینانەی خوا کاتی خـۆی کتێبی ناردوونەتەسەر، بە باشترین شێوەی گفتوگۆ نەبێ).

تەنانـەت ئاگرپەرسـتەکانیش لـەم ڕێکخسـتنە جوانـەدا پێگـەی خۆیـان هەیـە و، خـاوەن مـافی پێکـەوە ژیـان و هـاوڵاتی بـوونن، پێغەمبەری خوا (سڵاوی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: "هەمان مامەڵەی ئەهلی کیتاب (گاور و جولەکە)یان لەگەڵدا بکەن، تەنها ئەوەنەبێت کە قەدەغـەی کـردوون لــە خـواردنی سـەربڕاوەکانیان و مـارەکردنی ئافرەتـەکانیان"[1]. خـەڵکیش کاریـان بـەو ڕێنماییـەی پێغەمبـەر ﷺ دەکرد، دەبینین ڕۆژێك عومەری کوڕی خەتاب (خـوا لێـی ڕازی بێـت) پیاوێکی بەساڵاچووی بینـی کـە داوای یارمـەتی و سـواڵی لـە خـەڵکی دەکرد، زانی کە ئەوە پیاوێکی جولەکەیە و بەهۆی بەساڵاچوونییەوە توانای کارکردنی نەماوە؛ لەبەرئەوە دەستی پیاوەکەی گـرت و بـردی بـۆ گەنجینـەی موسـوڵمانان (بیـت المـال)، تـا مووچـەیەکی وای بـۆ ببڕنەوە کە پێداویستییەکانی دابین بکات و ئیتر پێویستی بـە دەسـت پانکردنەوە نەبێت لە خەڵکی.

بەڕاسـتی ئـەو پەیوەنـدی هاوڕێیەتیانـە زۆر قەشـەنگن کـە لـە سایەی ئەم حەقیقەتەدا دەبەسترێن، واتە لە سایەی بەزەیی و سۆز و یەکسانیدا.

---

[1]– السنن الکبری للبیهقي، حدیث: ١٣٠٧٤.



## کاتێك هاوڕێیەتی دەگۆڕێت بۆ خۆشەویستی لەپێناوی خوادا:



ئەم ئامانجە مرۆڤ دەگۆڕێت لە هاوڕێیەکەوە کە دەمگرییەنێت بۆ هاوڕێیەك کە دەمخاتە پێکەنین و دڵخۆشم دەکات، لە هاوڕێیەکەوە کە پێم پێ دەکەنێت بۆ هاوڕێیەك کە لەگەڵمدا پێدەکەنێت، لە هاودەمێکەوە کە لە دنیادا دەمپارێزێت بۆ هاودەمێك کە لە دونیاو قیامەتدا دەمپارێزێت... هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، بەم شێوەیە بوون کاتێك لەڕێگادا بە یەك دەگەیشتن دەستی یەکتریان دەگرت و دەیانوت: "وەرە دانیشە با ساتێك پێکەوە یادی خوا بکەین و ئیمانەکەمان تازە بکەینەوە"، ئیتر بۆماوەیەك پێکەوە دادەنیشتن تا یادی خوا بکەن.

ئەوەی ئێمەی موسوڵمان بڕوامان پێی هەیە ئەوەیە کە مرۆڤی ڕزگاربوو لە ڕۆژی قیامەتدا دەستی هاوڕێکەشی دەگرێت، بەم شێوەیە چەند جوانە کاتێك هاوڕێیەتی دەگۆڕێت بۆ ئەم ڕۆحە بەرزەی ڕەفتارکردن، بۆ ئەم دەروونە ئارامە، بۆ قوربانیدان، بۆ چاکەکاری، بۆ هاوڕێیەتی لەپێناوی خوای گەورەدا...

له موعازی کوڕی جەبەلەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیفەرموو: (قال الله عز وجل : المتحابون في جلالي لهم منابر من نور يغبطهم النبيون والشهداء) واتە: "خوای گەورە فەرموویەتی: ئەو کەسانەی لەبەر گەورەیی و خۆشەویستی من یەکتریان خۆشدەوێت لە ڕۆژی قیامەتدا مینبەری نورینی وەهایان هەیە کە پێغەمبەران و شەهیدان ئاواتی بۆ دەخوازن."[1]

دەگونجێت هەندێك کەس وا گومان بەرن کۆمەڵێك هاوڕێی وایان هەیە کە دڵسۆزی یەکترن و هەرگیز لە یەکتر جیانابنەوە، بەڵام وانە و پەندەکە تەنها لە دنیادا نییە، بەڵکو لە دنیاو قیامەتدایە پێکەوە.. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ﴾ الزخرف:٦٧، واتە: (دۆست و برادەران لەو ڕۆژەدا هەندێکیان دوژمنی هەندێکیانن، چونکە تێئەگەن کە ئەوان بوون بەهۆی گومڕا بوونیان، تەنها دۆست و برادەرانی وا نەبێ لە دنیادا لەخواترس بووبن ئەوانە هەر لەسەر دۆستایەتیی خۆیان ئەمێننەوە.)

---

١- سنن الترمذي، حديث: ٢٣٧٠.



## من هاوڕێم نییە:



هاوڕێ شتێك نییە بەسانایی پەیدابکرێت، بەڵكو پێویستە ماندوونەناسانە هەوڵ بۆ دەستخستنی بدەیت و، ئەگەر پاش ئەم گەڕانەت هاوڕێیەكی ڕاستەقینەت مسۆگەرنەكرد، ئەوا پێویستە بەخۆداچوونەوەیەك بكەیت. لەخۆت بپرسە:

كەموكوڕییەكانم چین...؟

..............................................................................

بەهرە و لێهاتووییەكانم چین؟

..............................................................................

بۆچی فلانەكەس لە من زیاتر هاوڕێ لەدەوری كۆدەبنەوە؟

..............................................................................

ئەو لەچیدا لەمن باشترە؟

كار و پیشەی چییە؟

..............................................................................

خاوەنی چ تایبەتمەندی و لێهاتووییەكە؟

..............................................................................

چۆن وەكو ئەوم لێدێت؟

..............................................................................

كەی وەكو ئەوم لێدێت؟

..............................................................................



## مەحاڵە هاوڕێیەکی ئەمەکدار لەم سەردەمەدا دەستبکەوێت !



زۆر باس لەوە دەکرێت کە دەستخستنی هاوڕێیەکی بەوەفا و دڵسۆز مەحاڵە !

لە ڕاستیدا ئەم جۆرە وتانە تاڕادەیەك مایەی گاڵتەجاڕین لام، ئەمەش لەبەرئەوە نا کە خۆم بە گەورە دەزانم، یا کەسێکی بێ وێنە و نموونەییم.



بەڵکو لەبەر ئەوەیە: ئەگەر بوونی هاوڕێیەکی بەوەفا شتێکی مەحاڵ بێت، ئەی چۆن شارستانییەتی ئیسلامی دەیان، بگرە سەدان، بەڵکو زیادەڕەوی ناکەم گەر بڵێم هەزاران نموونەی هاوڕێی دڵسۆزی لەخۆگرتووە؟! لەبەرئەوە دروست نییە بڕوا بەو وتانە بکەین، چونکە وتەیەکی دوور لە ڕاستییە و، هیچ دەقێکی فەلسەفی یان دەروونی یان زانستی نییە کە ڕاستی ئەم دەستەواژەیە بسەلمێنێت و، وامان لێ بکات بڕوای پێبکەین.

لەڕاستیدا ئەم وتەیە و هاوشێوەکانیشی جگە لە چەند ناونیشانێکی سەرنجڕاکێش هیچی تر نین...



## جۆرەکانی هاوڕێیەتی: 

- **هاوڕێیەتی لەگەڵ (خود)دا:**



ئایا ڕێککەوتووە جارێك لە جاران لە خۆمان بپرسین: دەکرێت ئێمە هاوڕێیەتی لەگەڵ خودی خۆماندا ببەستین؟ ئایا پرسیارەکە نامۆ دەرناکەوێت؟ چونکە هەمیشە وا باوە کە هاوڕێیەتی لەگەڵ کەسێکی تردا دەبەسترێت نەك لەگەڵ (خود)دا.

ئایا بوونی مرۆڤێك دابەش دەبێت بە دوو بەشەوە تا ئەو بەشانە هاوڕێیەتی یەکتر بکەن؟!.. واتە بەشێکیان ببێتە هاوڕێی بەشەکەی تر..

یاخود بابەتەکە پەیوەندی بە دوو ناوچەی جیاوازەوە هەیە لەناو ناخی خۆماندا، کە پێویستە پەیوەندییان باش بێت و ببنە هاوڕێی یەکدی؟!.

ئەگـەر ناوچـەی یەکـەم بـەرپرس بێـت لـە کـۆنترۆڵی ڕەفتـار و هەڵسوکەوتەکانمان و، ژێرباربێت بۆ ژمارەیەك ڕەهەندی دەرەکی، کە ئێمـە دەستنیشـانیان ناکـەین و دەسـەڵاتمان بەسـەریاندا نییـە، لەبەرئـەوەی لـە ژینگـەی دەرەکییـدا دروسـت دەبـن، بـێ ئـەوەی تێڕوانینـی ئێمـە لـە درووسـت بوونیانـدا لەبەرچـاوگیرابێت... ئـەوا ناوچـەی دووەمـیش بریتییـە لـەو ناوچـەیەی کـە لـەناو قـوڵایی دەروونماندایە.

بۆئەوەی لە خودی خۆت تێبگەیت و پێکبێیت لەگەڵیدا، ئەوا ئەم ئامۆژگارییە لە گوێ بگرە: "بۆ قوڵاییەکانی ناخـت دابچـۆ و، هـەرگیز فەرامۆشی مەکە، چونکە ئارامی بەتەنها لە قوڵاییەکاندا هەیە، هەر لە قوڵاییەکانەوە دەرفەتی ئـەوەمان دەبێـت کـە بەشـێوەیەکی ڕاسـت و دروست ببینین و، ببیستین و، جوڵە بکەین و، ئامادەییمان هەبێت بـۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سەختییەکانی ژیان".

هیچ نازونیعمەتێك نییە هاوتای ئەو نازونیعمەتە بێت کە مرۆڤ بـە قوڵایی بوونی خۆیدا ڕۆبچێت و، گوێبیستی هاوارەکـانی خـودی خـۆی بێت و، بەدەمیانەوە بچێت.

تونـدوتۆڵترین جـۆری پەیوەندییـەکانی هاوڕێیـەتی، ئـەو پەیوەندییەیە کە مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆیدا دەیبەستێت، جا ئەگـەر ئـەم پەیوەندییـە سـازبوو، ئـەوا هاوڕێیەتییـەکی ڕاسـتگۆیانە و،

وەفادارانــە و، پتــەو و، بەرهەمدارانــە دێتەکایــەوە. ئــەم چەشــنە هاورێیەتیــەش ئــەوە دەخوازێــت کــە پەیوەندییــەکی خۆشەویســتی و وابەستەبوونی پتەو لە نێوان دەروون و گیان و، ژیری و دڵدا پێکبێت.

ئەگەر مرۆڤ تەنها بە پشتبەستن بە ژیریی بژی، ئەوا ژیانێکی بێ تــام و چــێژی دەبێــت؛ چــونکە ژیــری بــەردەوام ساردوســڕە، بــەڵام لەبەرامبەردا دڵ گەرمگوڕە. ژیری بەرەو ڕۆتینی دووبـارە و، بێزارکـار و، بازنە داخراوەکان ئاڕاستەمان دەکات، بەڵام ئەوە دڵە کـە واتـا بـە تەمەن و، ئامانج بە ژیانمان دەبەخشێت.

دڵ توانایەکی بینایی شاراوەی هەیـە، کـە شـتەکان ڕازاوەتـر و، ناسکتر و، شیرینتر وێنادەکات. خۆئەگەر سەرپێچی بینایی دڵـت کـرد و پشتگوێت خست، ئـەوا ژیـان تـەنها وەك ئامۆژگارییـەکی بـێ گیـان دێتە پێش چاوت، بەم شێوەیەش خۆت گرفتاری بازنەیـەك دەکـەیت، کە تێیدا هەموو شتێك ئاسایی و بێگیان دێنە پـێش چـاوت و، هەسـت بە پەراوێزکـەوتن دەکـەیت، وەك ئـەو کەسـەی کـە بـەردەوام هـەمان هــەنگاوی پێشــووی بەشــێوەیەکی بێزارکــەر و ناچــاریی دووبــارە دەکاتەوە.

هاورێیــەتی لەگــەڵ (خــود)دا تــەنها کاتێــك جــێگیر و ســەقامگیر دەبێت، کە ئێمە خاوەنی بوێری گوێگرتن بین بۆ هاوارەکانی هەست و سـۆز و، متمانــەکردن بــە بینــایی کردنــی دڵ. زۆرجــار مــرۆڤ دەڵێــت:

"بەڕاستی من تـەنیام"، لـە کاتێکدا کـە زۆربـەی کاتـەکانمان لەگـەڵ خودی خۆماندا بەسـەردەبەین، بـەڵام "إنَّ لِنفسِـك عليـك حقـا" واتـە: (خــودی خــۆت–دەروونــت– مــافی بەســەرتەوە هەیــە)[1]، دەکرێـت هەڵوێستەیەکی کورتخایەن بکەیت و، لە خۆت بپرسیت:

"ئایا دەروونم (خودی خۆم) ڕازییە لێم؟"

**ئەگەر وەڵامەکە (نەخێر) بوو، ئەوا وەڵامی ئەمەی خوارەوە بدەوە:**

پێنج شت بنووسە، کە ئەگەر ئەنجامت دان، دەروونـت ئاسـوودە دەبێت پێیان...

..........................................................................................

بەڵام ئەگەر وەڵامەکە (بەڵێ) بوو، ئەوە بچۆ بۆ پرسیاری دواتر:

---

[1]– صحيح البخاري، جديث: ١٨٨١.

## * ئایا تۆ لە (خودی خۆت) ڕازیت؟

**ئەگەر وەڵامەکە (نەخێر) بوو، ئەوا وەڵامی ئەمانەی خوارەوە بدەوە:**

**ئەو شتانە چین کە تۆ لە (خود)ی خۆت چاوەڕوانی دەکەیت تا لێی ڕازیبیت، پێنج لەو شتانە بنووسە:**

......................................................................................................

......................................................................................................

......................................................................................................

......................................................................................................

......................................................................................................

**بەڵام ئەگەر وەڵامەکە (من ڕازیم لە خودی خۆم) بوو، ئەوا پیرۆزباییت لێ دەکەین، بەڕاستی بەختێکی باشت هەیە.**



- **هاوڕێیەتی دایکان و باوکان لەگەڵ ڕۆڵەکانیاندا:**

دەگونجێت هەندێك جار هاوڕێیەتی لەنێوان دایك و باوك و ڕۆڵەکاندا پێکبێت، کاتێك بەیەکەوە دەچنەدەرەوە بۆ شوێنە گشتییەکان و، شانبەشانی یەکدی ڕێ دەکەن و، گفتوگۆ دەکەن و، لەبارەی ژیانەوە قسەوباس دەکەن؛ منداڵەکە بە سینەفراوانییەوە ڕاوبۆچوون و ئامۆژگارییەکانی دایك و باوکی وەردەگرێت، نەك وەك فەرمانپێکردن و ناچاری، هەروەها بە دڵفراوانیی و خۆشحاڵییەوە جێبەجێیان دەکات؛ چونکە نهێنی پەیوەندییەکەیان ئەو هاوڕێیەتییە قەشەنگەیە کە لەنێوانیاندایە.



پێشینانیش جەختدەکەنەوە لەسەر ئەم جۆرە پەیوەندییە، واتە هەرکاتێك منداڵەکە هێندە پێگەیشت کە بتوانرێ پشتی پێ ببەسترێت، ئەوا کاتی ئەوە هاتووە دایك و باوك وەك هاوڕێ مامەڵەی لەگەڵدا بکەن؛ چونکە ئێستە ئەوان پێویستیان بە منداڵەکە زیاترە لە پێویستی منداڵەکە بەوان.

- **هاوڕێیەتی لە نێوان خوشك و براكاندا..**

زۆرجار لە خێزانێكدا جیاوازی لە سروشت و ڕەفتاری خوشك و براكاندا دەبینرێت، -



سەرەڕای ئەوەی كە هەموویان بە هەمان شێوازی پەروەردە گۆشكراون و، لە یەك ماڵدا گەورەبوون، بەڵام ئەم جیاوازییە ئەوە ناخوازێت كە ناكۆكی و دووركەوتنەوە لە نێوانیاندا بێتەكایەوە، بەڵكو دەكرێت ئەم جیاوازییانە بكرێنە دەرفەتێك بۆ بەستنی پەیوەندی هاوڕێیەتی وەها، كە هاوشێوەی ئەو پەیوەندی هاوڕێیەتییانە بن كە لەگەڵ كەسانی دەرەوەی سنووری خێزاندا دەبەسترێن، خۆ ئەگەر هاوڕێیەتیەكەشیان هەڵگری واتا باڵاكان و ئامانجەكانی هاوڕێیەتی بێت، ئەوا پەیوەندییەكی زۆر سەركەوتوو و بەرهەمداریان دەبێت.

• **هاوڕێیەتی لە قوتابخانە:**

قوتابخانە وەك ناوەندێكی فێربوون و پەروەردەكردن ژمارەیەكی زۆر قوتابی كۆدەكاتەوە، بەڵام تەنها هاوپۆل بوون، یاخود دەوامكردن لە یەك قوتابخانەدا بەس نییە بۆ بەستنی پەیوەندییەكی هاوڕێیەتی كاریگەر و چالاكانە، مەرجیش نییە بابەتی گفتوگۆ و قسەوباسەكانی



قوتابیان تەنها سەبارەت بە پرۆگرامەكانی خوێندن و مامۆستاكان بێت، بەڵكو پێویستە هەمەچەشن بێت، بەو مەرجەی بەباشی هاوڕێكە هەڵبژێردرێت و، هاوڕێیەك دەستنیشان بكرێت، كە ڕەفتار و ڕەوشتە باڵاكانی تێدا بەرجەستەبێت؛ چونكە خو و ڕەفتار و سیفەتەكانی هاوڕێیەك دەگوازرێنەوە بۆ هاوڕێكەی، لەبەرئەوەی هاوڕێ كەمەندكێشی خۆیت دەكات و، مرۆڤیش هاودەمی هەركەسێكی كرد، لە كۆتاییدا خوو و ڕەفتارەكانی وەك ئەوی لێدێت.



## پلەکانی هاوڕێیەتی:



ئەگەر هاوڕێیەتی لەنێوان چەند کەسێك، یاخود لە نێوان دووکەس لەمیانەی گروپێکدا دروست بوو، ئەوا بەدڵنیاییەوە پلە و ئاستی ئەو هاوڕێیەتییە جیاوازە، هاوڕێیەتی هەیە سەرپێییە و، هەیە قوڵ و گەرموگوڕە، چونکە هاوڕێیان هەمیشە بابەتێك، یاخود چەند بابەتێك، یا چەند بوارێك کۆیان دەکاتەوە...

هاوڕێیەتی سەرەتا بە پەیوەندییەکی ڕووکەشانە دەست پێدەکات، دواتر ڕۆدەچێتە نێو قوڵاییەکانی دەروونەوە، تا دەگاتە ئەو ئاستەی کە ئەو دوو هاوڕێیە وەك یەك کەسیان لێدێت، یاخود وەك ئەو نموونەیەیان لێدێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی دەکات. لە فەرموودەیەکدا کە ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (إنما مثل المؤمنين إذا التقيا مثل اليدين تغسل إحداهما الأخرى) واتە: "نموونەی دوو برا کاتێك بەیەك گەشتن وەك دوو دەستن کە یەکێکیان ئەوی تریان دەشۆرێت و پاك و خاوێنی دەکاتەوە."[1]

[1]– الترغيب في فضائل الأعمال لابن شاهين، حديث: ٤٣٣.

• هاوڕێیەتی بەرژەوەندیخوازی:



من (بەرژەوەندی) بە وشەیەکی ئاسایی دادەنێم و، هاوڕێگرتن بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی بەرژەوەندی بە کارێکی ئاسایی دەزانم؛ چونکە ژیان هەمووی لەسەر بەرژەوەندی ڕاوەستاوە، تەنانەت لە نێوان دایك و جگەرگۆشەکەیدا بەرژەوەندی هەیە ئەگەرچی ئەم دایکە و ئەو ڕۆڵە، بەڵام ئێمە دەتوانین وەك (هێنانەدی سوودی هاوبەش) یاخود (درێژکردنی دەستی هاوکاری بۆ بەرامبەر) هەژماری بکەین، نەك بەوجۆرە بۆی بڕوانرێت کە کارێکی خۆپەرستانەیە.

• هاوڕێیەتی لەنێوان دوو ڕەگەزدا:

هەموو شتێك وابەستەی نیەتە (نیاز)، نیەت خولگەی هەموو کارێکە کە مرۆڤ لەژیانیدا ئەنجامی دەدات، هەر بە نیەت ناوەڕۆکی ڕاستگۆیی و ناڕاستیی کردارەکانی مرۆڤ هەڵدەسەنگێنرێت؟ ئاخۆ

پەروەردگار کردەوەکەی قبوڵ دەفەرموێت، یاخود دەدرێتەوە بە ڕوویدا؟



لەبەرئەوە پێم باشە سەرنجی تۆی خوێنەر بۆ ئەم خاڵە گرنگە ڕابکێشم، بەتایبەتی کە زۆرێك لە لاوانی ئەمڕۆی خستۆتە دڵەڕاوکێوە -بە کوڕان و کچانەوە-... بەگشتی لاوان بە هەموو تێڕوانینە جیاوازەکانیانەوە سەبارەت بەم بابەتە لە دڵەڕاوکێدان، چ ئەوانەیان کە بەرگری لە هاوڕێیەتی نێوان هەردوو ڕەگەزەکە دەکەن بەهەموو جۆرەکانیەوە، چ ئەوانەی بەرگری لەم بۆچوونە دەکەن لەگەڵ هەبوونی هەندێ تێبینی و سەرنجدا، چ ئەوانەی لەبنچینەوە لە دژی ئەم بابەتەن، چ ئەوانەشی کە مەرج بۆ ئەم جۆرە پەیوەندیانە دادەنێن...

خاتوونە توێژەرێکی ئەمریکی لە بواری زانستی کۆمەڵناسیدا بە ناوی (جان یاجر) دەڵێت: (هاوڕێیەتییە ئەفلاتۆنیە پاك و بێگەردەکان لەگەڵ کەسانێك لە ڕەگەزی بەرامبەر لەڕووی تیۆرییەوە خوازراوتر و گونجاوترن).

ئەگەر ئەم ناونیشانە بریقەدارە بۆ بەستنی پەیوەندی لە نێوان هەردوو ڕەگەزدا بەشێوەیەکی تیۆریی پەسەند ببینرێت، ئەوا بێگومان لە لایەنی کردارییشەوە ئەگەری ڕوودانی هەیە.

من دڵنیام تۆش کاتێك ئەمە دەخوێنیتەوە هاوڕایت لەگەڵم، لەوەدا کە ئەگەر لەم سەردەمەدا کچێك بڵێت: "هاوڕێی کوڕم هەیە"، ئەوە بە کارێکی عەیبە و ئابڕووبەر بۆی هەژماردەکرێت، تەنانەت دەکرێتە بیانوویەك بۆ لەکەدارکردنی ئابڕوو و شۆرەتی... بەڵام ئەگەر کوڕێك بڵێت: ژمارەیەکی زۆر هاوڕێی کچم هەیە، ئەمەی بە جۆرێك لە مەردایەتی و بوێری بۆ هەژماردەکرێت!

ئەمە لەکاتێکدایە هەموومان دەزانین کوڕان و کچانی ئەمڕۆ هاوڕێیەتی ڕەگەزی بەرامبەریان دەکەن بەڵام لەژێر سایەی پەردەپۆشکردنێکی کۆمەڵایەتیدا.

بەهەرحاڵ! ئەم بابەتە بابەتێکی فرەڕەهەند و ئاڵۆزە و، دیدی شارستانیەتییەکانیش لەبارەیەوە جیاوازە، ئەوانەشی لەبارەیەوە دەدوێن کەمن، ئەمەش لەترسی کەوتنە نێو بۆسەی باسوخواسەکانی ئەمسەردەمەوە، بەڵام کەواتە چار چییە؟ لێرەدا تەنها دەڵێم: "الإثم ما حاك في نفسك، و خشيت أن يطلع عليه الناس"، واتە: **تاوان ئەوەیە کە لە سینەتدا گەڵاڵەدەبێت و، دەروونت ئازار دەدات، هەروەها دەترسیت لەوەی خەڵکی لەبارەیەوە بزانن.**

• هاوڕێیەتی لەنێوان (ژن و مێرد)دا:

پەیوەندی نێوان ئەو دوو هاوسەرە چەند جوان و قەشەنگە، کە گەیشتووەتە ئاستێکی هێندە بەرز و گەرموگوڕی وەها، کە هەموو ژن و مێردێك هەردەم خوازیارن پەیوەندییەکەیان بەم جۆرە و لەم ئاستەدا بێت، نەك ئەوەی تەنها پیاو گەورەی ماڵ بێت و، هاوسەرەکەی (فەرمانبەردار)ێکی فەرمانەکانی ئەو بێت.

بەڵکو چەند شیرینە ئەگەر پەیوەندییەکەیان بگاتە ئاستی هاوڕێیەتی، ئەمەش بێ ئەوەی سنووری پەیوەندیی ژن و مێردبوونیان ببەزێنن و، یاسای هاوسەرداری پێشێل بکەن و، لە کلتوری باو دەربچن. نموونەی ئەم پەیوەندییە جوان و شیرینەش لە ژیانی پێغەمبەرماندا ﷺ دەبینین کە مامۆستای مرۆڤایەتییە...



ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کە لە پشتی خۆیەوە بە عەباکەی شوێنی سواربوونی بۆ دروست کردبوون، پاشان لە تەنیشت وشترەکەیەوە دانیشت و، سەفیەی خێزانیشی قاچەکانی خستە سەر هەردوو ڕانی پێغەمبەر تا سەرکەوتە سەر وشترەکە.

پێغەمبەر ﷺ لەسەر زەوی دادەنیشت و داوای لە خێزانەکەی دەکرد کە قاچ بخاتە سەر قاچەکانی ئەم و سەرکەوێتە سەر وشترەکەی، دەزانن ئەوە کێیە ئەمە دەکات؟ ئەوە سەرکردەی سوپای موسوڵمانانە، ئەوە پێغەمبەری خوایە و، ڕابەر و ڕێ نیشاندەری مرۆڤایەتییە -هەزاران جار درورد و سڵاوی خوای لێبێت-.

لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (إنك لن تنفق نفقة تبتغي بها وجه الله إلا أجرت عليها ، حتى ما تجعل في فم امرأتك). واتە: " باشترین چاکە و بەخشین کە چاوەڕوانی پاداشت بیت لەبەرامبەریدا پاروویەکە پیاوێك دەیکات بە دەمی ژنەکەیەوە".[1]

هەروەها لە جێ دەمی عائیشەی دایکی ئیمانداران‌ەوە ئاوی دەخواردەوە، لەو پەرداخەی کە ئاوی پێ خواردبووەوە؛ تەنانەت

---

[1]- صحيح البخاري، حديث: ٥٦.

پێشبڕکێشی لەگەڵدا دەکرد. بەڕاستی ئەمە پەیوەندییەکی هاوڕێیەتی زۆر قەشەنگە لە نێوان ئەو دوو هاوسەرەدا.

- **هاوڕێیانی ئینتەرنێت:**

ئینتەرنێت هۆکاری پەیوەندیکردنە نەك پەیوەندی بەستن، کەواتە چۆن مرۆڤێك کەسێکی نەناسراو دەکاتە هاوڕێی خۆی لە کاتێکدا ناتوانێت بیبینێت! خۆ ئەگەر بیشیبینێت نازانێت ڕەفتار و کەسایەتی ئەو کەسە چۆنە! مرۆڤیش بە سروشتی خۆی دوژمنی ئەو شتەیە کە نایناسێت و ئاشنانییە پێی، لەبەرئەوە ناکرێت




ئینتەرنێت بکەینە هۆکاری دەستکەوتن و بەستنی پەیوەندی هاوڕێیەتی دڵسۆزانە، بەڵام دەشێت بۆ سازدانی پەیوەندیی کاتی و

گوزەراو پشتی پێببەسترێت، ئەم پەیوەندییە کورتخایەنەش تەنها بە مەبەستی ئاڵوگۆڕی زانیاری بەسوودبێت، نەك هۆكاری بەفیڕۆدانی كات و داواكاری نابەجێ بێت.

توێژینەوەیەکم لەسەر ژمارەیەك لە قاوەخانەکانی ئینتەرنێت ئەنجامدا، لە چەند شوێن و کاتێکی جیاوازدا بۆ ماوەی شەش مانگ:

**دیارترین دەرەنجامەکانی توێژینەوەکەشم ئەمانەبوون:**

- ڕێژەی (٨٥٪)ی سەردانکەران خوویان بەم قاوەخانانەوە گرتووە.

- ڕێژەی (١٥٪)یان خووی یاریکردنی هەبوو لەگەڵ کەسانی تر.

- ڕێژەی (٧٠٪)یان خووی پەیوەندیکردنی بە هاوڕێیانەوە هەبوو بە بیانووی کەیفخۆشیی و چێژ وەرگرتن.

- ڕێژەی (٣٥٪)یان لە کاتژمێر (١٢)ی نیوەی شەوەوە تا (٨)ی بەیانی دەمانەوە.

- ڕێژەی (٢٠٪)یان بەپێی کاتی دەستبەتاڵییان سەردانیان دەکرد.

- ڕێژەی (٦٠٪)یان (٢-٤) کاتژمێریان لەم قاوەخانانە بەسەردەبرد و، کاتەکانی تریان لەماڵەوە بەخەرج دەدا.

لە تاقیکردنەوەیەکی تردا کە لەگەڵ ژمارەیەك لاودا ئەنجاممدا، هەموو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی ئینتەرنێتمان بەکارهێنا، بە مەبەستی

سازدانی پەیوەندی هاوڕێیەتی و، لەم نێوەندەشدا چەندین ناوی خوازراومان بەکارهێنا، بە تایبەتی بە ناوی کچانەوە پەیجەکانمان کردەوە و داوای هاوڕێیەتیمان دەکرد، تێبینیمان کرد ڕێژەیەکی زۆر وەڵامی داواکاریەکانیان داینەوە و، ژمارەیەکی تر داوای هاوڕێیەتییان لێکردین. بەتایبەتی خواستی هاوڕێیەتی لەسەر ئەو پەیجانە زۆر بوون کە بە ناوی کچانەوە کردبوومانەوە، بێگومان خوازیارانیش کوڕان بوون! لەبەرئەوە دەبینین لەم ژینگە خەیاڵییەدا زۆرێك لە گەنجان کەسێتی خۆیان وەك کچ دەردەخەن، بەمەبەستی دەستکەوتی مادی و هەندێ مەبەستی تری خۆیان.

- **هاوڕێیەتی لەگەڵ شتانی تری جگە لە مرۆڤ:**

هاوڕێیەتی بەتەنها لەنێوان مرۆڤ و مرۆڤەکانی تردا نییە، بەڵکو هەندێکجار مرۆڤ لەگەڵ شتەکانیشدا جۆرە پەیوەندییەك دەبەستێت، لەگەڵ دیاردە سروشتییەکان و، شتە بچوکەکان و، وردەکارییە زۆر وردەکانیشدا.



دەگونجێت لەگەڵ شوێنێکی دیاریکراودا هاوڕێیەتییەکی گەرم پێکبێنیت، کە یادگارییەکانی دەتگێڕنەوە

بۆ ڕابردوویەکی شیرین، دەکرێت سوچێکی گەرمی ماڵەکەتان ببێتە هاوڕێت، یاخود کورسییەك کە چەندەها یادگاری و بەسەرهاتی خۆشت لەکاتی دانیشتن لەسەریدا دیبێت، تەنانەت دەکرێت کتێبێکی بەسوود و سەرنجڕاکێشیش وەك هاوڕێ بێتە پێشچاوت، هەموو ئەمانە و شتی تریش دەکرێت مرۆڤ وەك هاوڕێی خۆی لێیان بڕوانێت.

لەڕاستیدا ئەوە واتا باڵاکان و بەها مەعنەوییەکانە کە ئێمەی مرۆڤ بەرەو هاوڕێیەتی کەمەندکێش دەکات نەك شتی ماددی و خودی کەسەکان؛ چونکە چەمکی (هاوڕێ) زۆر لە ڕووکاری کەسێك زیاتر واتا هەڵدەگرێت، دەبینین کەسەکان زۆرن، بەڵام ئێمە لەنێو ئەم هەمووەدا کەمینەیەك یا ژمارەیەکی دیارکراو لە هاوڕێ هەڵدەبژێرین، ئەوانەی کە دەتوانن ئەو واتا و چەمکانەی هاوڕێیەتی بەرجەستە بکەن کە ئێمە مەبەستمانە..

هاوڕێ ئەو کەسەیە کە ئێمە وەك هاوژیانی خۆمان هەڵیدەبژێرین، چونکە ڕەنگدانەوەی واتا و بەها باڵاکانی هاوڕێیەتی دەکات، لەو هاوڕێیەتیانەش کە لەگەڵ جگە لە مرۆڤدا پێکدێن:

- هاوڕێیەتی لەگەڵ ڕووەکدا:

تا ئێستەش دیمەنی داپیرەم لەیادە، کە لەدەمی بەرەبەیانیاندا و پاش نوێژی بەیانی هەڵدەستایەوە و، دەچووە لای ئەو گوڵ و ڕووەکانەی کە لە قەراغی حەوشی ماڵەکەمانەوە ڕوواندبوونی، قسەی

بۆ دەكردن و، وەك هاوڕێی گیانی بەگیانی لەگەڵیان دەدوا و، ئاوی دەدان و چیرۆك و سەرگوزشتەی بۆ دەگێڕانەوە.

زانستی سەردەمیش لە ڕێگەی ئەزموونی سەلمێنەرەوە گەواهیدەری ئەو ڕاستییەیە كە مرۆڤ دەتوانێت شێوەیەك لەشێوەكانی گفتوگۆكردن و پەیوەندی لەگەڵ ڕووەكدا پێكبهێنێت.

## - هاوڕێیەتی لەگەڵ شتە بێگیانەكاندا:

ئایا دەگونجێت پەیوەندی هاوڕێیەتی لەگەڵ دیوارەكاندا ببەسترێت؟ بڕوام وایە بە بینینی ئەم پرسیارە دەتەوێت ئەم كتێبە دابخەیت و چیتر بەردەوام نەبیت لەخوێندنەوە، چونكە پێت وایە ئەوە پرسیارێكی نیمچەشێتانەیە!

بەڵام ئایا بێگیانەكانیش بەدیهێنراوی پەروەردگار نین؟ ئایا خوای گەورە دەربارەی هەموو بەدیهێنراوەكانی نەیفەرمووە: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ ....﴾ الإسراء: ٤٤، واتە: (هەرچی شت هەیە هەموو تەسبیحاتی خودا ئەكەن). ئایا وردە بەرد (زیخ و چەو) لە چنگی پێغەمبەری خوادا ﷺ تەسبیحاتی نەكرد؟ ئایا پەلی درەخت لەتاسەی دووری پێغەمبەردا ﷺ ئەسرینی نەڕشت؟

لەبەرئەوە پێویستە ئەمجۆرە هاوڕێیەتییەش فەرامۆش نەكەین و، زۆر بە وردی لێی ڕابمێنین..

- هاوڕێیەتی و بەئەمەکبوون لەئاست ئاژەڵاندا:

ئــەم جــۆرە هاوڕێیەتیــە لای ئێمــە تــەنها لــە شــێوەی دەستەواژەیەکدا هەستی پێدەکرێت و هیچی تر، چونکە ئێمە کاری پێناکەین، وا نازانین توانای پەیڕەوکردنیمان هەیە، لەکاتێکدا لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا بە کرداری جێ بەجێ دەکرێت. خۆ ئەگەر کەسێکیش هاوڕێیەتی ئاژەڵان بکات، ئەوا ڕاستەوخۆ سەگێك دەکاتە هاوڕێی خۆی! وەك ئەوەی سەگ تەنها ئاژەڵێك بێت گونجاو بێت بۆ هاوڕێیەتی!

بێگومان ڕوونکردنەوەی دوورودرێژ هەیە سەبارەت بە سەگ و، حوکمەکانی مامەڵەکردن لەگەڵیدا و، ڕاگرتنی، ئێمەش هیچ ڕقێکمان لە سەگ نییە، بەڵکو ئەو حوکمانەی لەبارەی سەگەوە هاتوون بۆ لایەنی گڵاویەتی، بەڵام لەهەمان کاتدا ئاینی ئیسلام ڕێیداوە سەگ بۆ پاسەوانی و، ڕاو و شکار و، هەرکارێکی تری پێویست ڕابگیرێت.

لەیادمــە یــەکێك لــە قورئانخوێنــە بەناوبانگــەکان و زانــا پایەدارەکانی (شام) کە ناوی (شوکری ئەللەحەفی) بوو، وەك خویەکی ڕۆژانەی شیری بە پشیلەیەك دەدا و، وەك میوانێك پێشوازی لێ دەکرد و بێ شیری نەدەکرد، تەنانەت لەو دەوریەی کە خۆی نانی

تێدا دەخوارد شیریشی دەدا بە پشیلەکە و، دەوریەکەی بۆ دەخستە سەر سینی خوانەکەی و لەبەردەمی پشیلەکەدا دایدەنا.

ئەبو هورەیرەی هاوەڵی پێغەمبەریش ﷺ بەردەوام پشیلەی پێ بووە و، زۆر کەم ڕێ کەوتووە کە لە شوێنێك بێت و پشیلەی پێ نەبێت، هەر لەبەر ئەمەش بووە پێیان وتوە (ئەبو هورەیرە) واتە (باوکی پشیلە).

ناونانی ئاژەڵان لەناو هاوەڵاندا (خوا لێیان ڕازی بێت) شتێکی ئاسایی و باو بووە، چونکە ئاژەڵانیش بەدیهێنراوی پەروەردگارن و، پێویستە ڕێزیان بگرین، خۆ ئەوانیش مافیان هەیە لەم سەر زەویەی پەروەردگاردا.

ئەبو تەڵحە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەسپێکی هەبوو ناوی لێ نابوو (مەندوب)، پێغەمبەری خوداش ﷺ ئەسپێکی هەبوو پێیان دەوت (لوحەیف)، موعازیش (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "من لە پاشی پێغەمبەرەوە ﷺ سواری گوێدرێژێك بووم، پێیان دەوت (عوفەیر)".

## چیرۆکی وشترەکەی پێغەمبەر ﷺ کە ناوی (العضباء) بوو:

(العضباء) ئەو وشترەی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ کە هیچ وشترێك پێشی نەدەدایەوە، بەلام جارێکیان وشتری پیاوێکی دەشتەکی پێشی دایەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (حق علی

الله أن لا يرتفع شيء من الدنيا إلا وضعه) واته:"مافه لەسەر خوای گەورە هەرشتێك لە دونیادا بەرز ببێتەوە خوای گەورە دایدەبەزێنێت و نزمی دەکاتەوە".[1]

جارێك بێ باوەڕان دەستیان بەسەر (العضباء)دا گرت و، لەگەڵ ئافرەتێك و چەند کەسێکی دیکەشدا بەدیلیان گرتن، بەڵام ئافرەتەکە فرسەتی هێنا و بە سواری وشترەکە لە دەستی بێباوەڕان هەڵهات، کاتێك بێباوەڕان بەوەیان زانی، کەوتنە دوای ئافرەتەکە، بەڵام نەیانتوانی دەستگیری بکەنەوە، لەو ساتانەدا کە شوێنی ئافرەتەکە کەوتبوون و، هێندەی نەمابوو بیگرنەوە، ئافرەتەکە نەزری کرد: کە ئەگەر بە وشترەکە نەگەنەوە، ئەوا بیکاتە قوربانی و سەری ببڕێت. کاتێك ئافرەتەکە گەیشتەوە ناو کەسوکاری، ئەم هەواڵەیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیاند، ئەویش فەرمووی: (سبحان الله ، بئسما جزتها ، نذرت لله إن نجاها الله عليها لتنحرنها ، لا وفاء لنذر في معصية، معصية ، ولا فيما لا يملك العبد) واتە: "سبحان الله، خراپترین پاداشتی دایەوە، خوای گەورە لەسەر پشتی ئەو وشترە رزگاری کرد، بەڵام ئەو دەیەوێت سەری ببڕێت، نەخێر وەفا بە نەزرێك

[1]- صحيح البخاري، حديث: ٢٧٣٨.

ناکرێت که سەرپێچی فەرمانی خودای تێدابێت، هەروەها لەشتێکدا که موڵکی خۆی نەبێت".[1]

- **ئایا هاوڕێیەتی پاش دەمەقاڵە و پیاهەڵشاخان دێتەکایەوە؟**

ڕەنگە سەرچاوەی ئەم پرسیارە وتەیەکی کۆن بێت کە دەڵێت: "تەنها پاش دەمەقاڵە و پیاهەڵشاخان هاوڕێکەت هەڵبژێرە".

هەندێك کاتیش ڕاستی ئەم وتەیە لە واقیعدا دێتەکایەوە، چونکە سەرزەنشت و دەمەقاڵەی توند گوزارشت لە ناخی مرۆڤ دەکەن و، پاش هێوربوونەوەش پاکی و بێخەوشیی بۆ دەروونی کەسەکە دەگەڕێتەوە و، خەوش و خاڵی سینەی پاك دەبێتەوە.. دەشگونجێت دەمەقاڵە و بەیەکدا هەڵشاخین هۆکارێك بێت بۆ بەیەکگەیشتن و، لە داهاتوودا ببێتە یادەوەری و هەرکات هەڵوێستەکە دووبارەبوویەوە یادەوەریەکەشی لەگەڵ خۆیدا بێنێتەوەیاد.

---

١- صحيح مسلم، حديث: ٣١٨٤.



بەهەرحاڵ بەواقیع بوونی ئەم ناونیشانە پەیوەستە بە ئاستی ڕۆشنبیری ئەو کۆمەڵگەیەی کە هاوڕێکان تێیدا دەژین، دەگونجێت کۆمەڵگەیەك هەبێت کە ڕۆشنبیریەکەیان لەسەر شەڕ و جنێودان و لێدان و بەکارهێنانی هێز و سەلماندنی بەهێزیی جەستە و بازووەوە بێت، لەم جۆرە کۆمەڵگەیەشدا دەبینین کاتێك هاوڕێیەك دەیەوێت گاڵتەوگەپ لەگەڵ هاوڕێکەی بکات، سوکە مستەکۆڵەیەك دەکێشێت بە سکی هاوڕێکەیدا، وەك گوزارشتێك لە خۆشەویستیی زۆری بۆ هاوڕێکەی؛ لەبەرامبەردا کۆمەڵگەیەکی تر دەبینین، کە تیایدا مایەی شەرمەزاری و عەیبەیە ئەگەر کەسێك هاوڕێکەی ماچ بکات، یان هاوڕێیان ماچی یەکتر بکەن، بەتایبەت بۆ پیاوان؛ لەکاتێکدا لە

کۆمەڵگەیەکی دیکەدا دەبینی بۆنموونە هاوڕێیـان پێنج جـار یـەکتری ماچ دەکەن، بەمەبەستی دەربڕینی خۆشەویستیی توندیان بۆ یەکدی.

بەم شێوەیە لێرەولەوێ چەندین جۆری جیاوازی کۆمەڵگـە بـەدی دەکرێـت، کـە ڕۆشـنبیری و دابونـەریتی جیـاواز پەیڕەودەکـەن لـەنێو چین و توێژە جیاجیاکانیاندا، کەواتە بابەتەکە پەیوەسـتە بـە ئاسـتی ڕۆشنبیری کۆمەڵگەکە و، ئـەو دابونەریتانـەی کـە ناسـیاو و دۆسـت و هاوڕێیان لەسەری ڕاهاتوون.

- **کۆتایی هێنان بە ناکۆکی نێوان هاوڕێیان:**

لەڕاسـتیدا جیـاوازی بـیروڕا و تێڕوانینـەکان لـە نێـوان هـەر دوو کەسێکدا شتێکی ئاسایی و سروشتییە، خـۆ ئەگـەر پەیوەنـدی نێـوان ئەو دوو کەسە هاوڕێیەتییەکی گەرموگوڕ بێت، ئەوا بەخێرایی چاو لـە هەڵە و کەموکورتییەکانی یەکتر دەپۆشن و یـەکتر دەبەخشـن؛ بـەڵکو ئەگـەر پەیوەندییەکـەیان ڕاسـتگۆیانە بێـت، ئـەوا ئـەو هاوڕێیـە چـاو دادەخـــات لـــە ئاســـتی هەڵـــەکانی بەرامبەرەکـــەی و بـــەدوای کەموکورتییەکانیدا ناگەڕێت و، هەرکاتێك ناکۆکییەك یان شتێکی لـەو جـۆرە لەنێوانیانـدا ڕوویـدات، بـەخێرایی بـەرەو چارەسـەرکردنی و ئاشتەوایی هەنگاودەنێن و، کار بۆ بنەبڕکردن و کۆتایی پێهێنانی ئـەو

ناکۆکیـــە دەکـــەن، تـــا پاشمـــاوە و کاریگـــەری نـــەرێنی لەســـەر پەیوەندییەکەیان کەڵەکە نەبێت.

بـۆ دووپاتکردنـەوەی ئـەم ڕاسـتییەش دەبیـنین لـە سیسـتمی ئیسلامیدا پێغەمبەری خوا ﷺ جەخت لەسەر ئەو ڕاستییە دەکاتەوە، کە نابێت هیچ کەسێك قسە لە هاوڕێکەی دابـبڕێت بـۆ مـاوەی زیـاد لـە سێ ڕۆژ. هەروەها ئاماژەشـی بـەوە کـردووە، کـە ئەگـەر دوو هـاوڕێ دەمەقاڵـە یـا ناکۆکییـەك لەنێوانیانـدا ڕووبـدات، ئـەوا باشـترینیان ئەوەیانە کە دەستپێشخەری دەکات بۆ سڵاوکردن لە هاوڕێکەی.

- **پارێزگاریکردن لە پەیوەندی هاوڕێیەتی:**

ئەگـەر مـرۆڤ هاوڕێیـەکی ئامۆژگاریکـاری دڵسـۆزی دەسـتکەوت، ئەوا با پارێزگـاری لـە خۆشەویسـتی نێوانیـان بکـات، بـا شـانازی بـە هاوڕێکەیەوە بکات و، دەستبەرداری نەبێت؛ چونکە ئەو هاوڕێ چـاکە بـەنرخترین دەسـتمایەی مرۆڤـە، تەنانـەت بـەنرخترە لـە هـەموو گەنجینەکانی دنیا.

لەڕاستیدا گرنگ هاوڕێی زۆر و مـاوەی درێـژی هاوڕێیـەتی نییـە، بـەڵکو گـرنگ هەسـتی تـەبایی و هۆگربـوون و خۆشەویسـتییە، پارێزگاریکردن لـە پەیوەنـدی هاوڕێیـەتی زۆر لـە پەیـداکردنی خـودی هاوڕێ دڵسۆزکەش گرنگترە.

- **قەرزکردن لەنێوان هاوڕێیاندا:**

هەندێ کەس وا گومان دەبەن کە ئەگەر بابەتی دارایی هاتە نێو بازنەی هاوڕێیەتییەوە، ئەوە دەیشێوێنێت و، دەیگۆڕێت بۆ خۆپەرستی و هەل وەرگرتن و خراپ سوود وەرگرتن لەو هاوڕێیەتییە، ئەمەش بیرکردنەوەیەکی هەڵەیە، چونکە هاوڕێی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە هاوڕێکەی هاوبەش پێ بکات لە هەموو ئەو شتانەدا کە خاوەنییەتی و، ماڵ و سامانی خۆی لەخزمەتیدا بخاتەڕوو، لەکاتی پێویستیدا هاوکاریی و پشتیوانی لێ بکات و، بچێت بەهانایەوە و پێداویستییەکانی بۆ دابین بکات.

هەروەها ئەگەر هاوڕێکەی داوای شتێکی لێبکات، ئەوا بەخێرایی بۆی دەستەبەربکات و، بەپێی توانا و بێ زۆر لەخۆکردن پێویستیی هاوڕێکەی دابین بکات، هەرکاتێك قەرزی پێدا پشوودرێژانە مۆڵەتی تەواوی پێبدات و، تا لە باری هاوڕێکەی دڵنیا نەبێت داوای لێ نەکاتەوە، خۆئەگەر هاوڕێکەی نەیتوانی قەرزەکەی بداتەوە، ئەوا چاوپۆشی لێ بکات و، ئەگەر توانی لێی خۆش بێت و لێی وەرنەگرێتەوە.

– قەرز لە هاوڕێیەکت مەکە، گەر پێشوەخت دڵنیابیت کە ناتوانیت بیدەیتەوە.

- قەرز بە هاورێیەك مەدە، گەر دڵنیابیت ناتوانیت بە دواکەتن و نەدانەوەی قەرزەکەی قایل ببیت.
- تا دەتوانن پارێزگاری لە هاورێیەتی نێوانتان بکەن.




پرۆسەی هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی هاورێی باش هیچ جیاواز نییە لە گەشتی گەڕان بەدوای زێڕ و گەوهەر و گەنجینە شاراوەکانی ناخی زەوی، لەبەرئەوە پێویستە خۆت ئامادە بکەیت، چونکە گەشتێکی سەختت لەپێشە بەمەبەستی پەیداکردنی هاورێی دڵسۆز، یان ئەو هاورێیەی کە لە هاوشێوەکانی دڵسۆزترە بۆت.

- **سیفەتەکانی هاورێ:**

ڕاستگۆیی و، خۆشەویستی و، دڵسۆزی و، ڕۆشنبیربوون و، خاکی بوون و، بوێری و، ئازایەتی و، بەرپرسیارێتی لەئەستۆگرتن و چەندین سیفەتی دیکەش، لەو سیفەتانەن کە هەموو کەسێك هیواخوازە و خەون دەبینێت کە لە هاورێکەیدا بەرجەستەبن.

لە هەموو ئەمانەش گرنگتر بوونی هاوڕێیەکی ئامۆژگاریکار و ڕێنموویيکارە، کە لەپێناو بەرژەوەندی خۆتدا بتگرییەنێت زیاتر لەوەی کەیفخۆشت بکات.

پیاوچاکانیش وتوویانە:

**"هاوڕێیەتی کەسێك مەکە کە بە گوفتار و ڕەفتارەکانی بەرەو ڕێی پەروەردگار ڕێنوویيت ناکات".**



## هاوڕێی خراپ:

هـاوڕێ خراپــەکان فرەجـۆر و هەمەچەشــنن، هەیانــە هــەر لــە بنەڕەتــەوە کەسـێکی خـراپ و بــەدخووە و، هــەر لــە منداڵیــەوە بــە پەروەردەیــەکی خراپــی خێـزان یـا ژینگــەی کۆمەڵایــەتی گۆشـکراوە، چونکە مرۆڤ بە خراپی و بەدخوویی لە دایك نابێـت، بـەڵکو بـە پـاك و بێگەردی لەدایك دەبێت.

پێغەمبــەری خــوا ﷺ دەفــەرموێت: "هــەموو کۆرپەیــەك لەســەر فیترەتێکی پاك و بێگەرد لەدایك دەبێت، بەڵام ئەوە باوك و دایکیەتی کە وەك جولەکە یان گاور یان ئاگرپەرست گۆشی دەکەن".

هەندێك کەسـی دیکـە بـەهۆی چـەند بـارووزروفێکی ژینگەکەیـەوە سروشـتی پـاك و بێگــەردی شـێواوە، چـونکە کاریگــەری نــەرێنییان لەسەر کەسێتیی جێهێشتووە.

هەنــدێك کەســی دیکــە ســەرەتا تــەنها بــۆ تاقیکردنــەوە و ئەزموونکردنی ڕەفتارە خراپەکان ئەسپی خۆی تاوداوە، بـەڵام دواتـر کار لەکار تـرازاوە و نـەیتوانیوە بگەڕێتـەوە سـەر سروشـتی پـاکیی و ئەمیش وەك مرۆڤە خراپەکانی لێهاتووە.

هەندێك کەسی دیکە بەهۆی لادانیان بەلای بەرژەوەندییەکی ماددیدا، کە بەهۆیەوە بتوانن کاروبارێکی ژیانی پێڕاپەڕێنن، گرفتاری ڕێی خراپ بوون.. نموونەی ئەم جۆرە کەسانەش زۆرە لە کۆمەڵگەدا.

بەگشتی تێکڕای ئەم هاوڕێ خراپانە دابەش دەبن بۆ دوو گروپی سەرەکی، گروپی یەکەمیان ئەو هاوڕێیانەن کە بەشێوەیەکی ئاسایی مامەڵە و ڕەفتار لەگەڵ کەسانی دەوریان دەکەن و، بانگەشەی هیچ کەسێك ناکەن بۆ پابەندبوون بە بیروبۆچوونەکانیانەوە و، زۆر بە کەمیی تێکەڵی کەسانی دیکە دەبن و پەیوەندیان لەگەڵدا دەبەستن.

هەشیانە بە ئاشکرا بانگەشەی هیچ کەس ناکات، بەڵام پێشوازی لەهەر کەسێك دەکات کە بیەوێت وەك ئەو خراپە ئەنجام بدات و لە نەفامیەوە بگلێت.. جۆرە مەترسیدارەکەشیان ئەوەیانە کە زۆرترین هاوڕێ بۆلای خۆی کەمەندکێش دەکات، تا سەرگەردانیان بکات و، بتوانێت فریویان بدات و دەسەڵاتی خۆی بەسەریاندا بسەپێنێت، بۆئەوەی لەنێو کۆمەڵگەدا تەنیا نەبێت و، بەهۆی ڕەفتارە خراپەکانییەوە لەخەڵکی دوورەپەرێز نەبێت، هەوڵدەدات زۆرترین کەس لەسەر بیروبۆچوونی ژەهراوی خۆی پەروەردە بکات و، بانگەشە بۆ کارە خراپەکانی دەکات، بەجۆرێك کە لە شێوازەکانیدا لە نوێنەری شەیتان دەچێت! سەرقاڵی بازاڕ پەیداکردن دەبێت بۆ کارەخراپەکان و ڕازاندنەوەیان لەبەرچاوی خەڵکیدا، بۆئەوەی

زۆرترین مشتەری و هاودەم کۆبکاتەوە بۆ گرتنەبەری هەنگاوەکانی شەیتان.

ئەبو موسا (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (إنما مثل الجليس الصالح ، والجليس السوء ، كحامل المسك ، ونافخ الكير ، فحامل المسك : إما أن يحذيك، وإما أن تبتاع منه ، وإما أن تجد منه ريحا طيبة ، ونافخ الكير : إما أن يحرق ثيابك ، وإما أن تجد ريحا خبيثة).

واتە: "نموونەی هاونشینی چاك و خراپ وەك فرۆشیاری میسك و (فودەر)ی کورەی ئاسنگەری وایە، فرۆشیاری میسکەکە یان لێی دەکڕیت، یاخود بۆنە خۆشەکەی دەچێت بەسەرتدا، فودەری کورە ئاسنگەریەکەش یان جلوبەرگەکەت دەسوتێنێ، یاخود بۆنە ناخۆشەکەی دەچێت بەسەرتدا".[١]

---

[١]– صحيح مسلم، حديث: ٤٨٦٨.



## بەباشی هاوڕێکانت هەڵبژێرە



**چیرۆکێک:**

بازرگانێکی بەناوبانگ هەبوو، خوای گەورە تەنها یەك كوڕی پێ بەخشیبوو لە هاوسەرە چاکەکەی، کە چەند ڕۆژێك پاش لەدایکبوونی کوڕەکەی کۆچی دوایی کردبوو، هەربۆیە منداڵەکە لەژێر چاودێری باوکیدا گۆش بوو و پێگەیشت، تا بووە لاوێکی پێکەوتوی قەدوباڵابەرز و شۆخ و بەتوانا، کە هەموو کچێك ئارەزووی دەکرد ئەم کوڕە بیخوازێت بۆ هاوسەری.

گەنجەکە بەهۆی ئەم خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندیەوە دەستی کرد بە زیادەخەرجیی و، تەخشان و پەخشانکردنی پارەیەکی زۆر لە هۆکارەکانی خۆشگوزرانی و خۆشڕابواردندا، هەتا زیاتر پارەی پەرش و بڵاوبکردایەوە هاوڕێی زیاتر دەوریان دەدا، هێواش هێواش خوی گرت بەسەردانی شوێنە بەدناو و خراپەکانەوە کە کاروڕەفتاری خراپیان تێدا ئەنجام دەدرا، بێ هیچ گوێپێدانێك پارەی بۆ هاوڕێکانیشی خەرج دەکرد و هەر ڕۆژەی بۆ لایەك دەچوو و، هەردەمەی سەفەری بۆ وڵاتێك دەکرد.

کاتێك بەتەواوی ڕۆچوو لە خووی شەوبێداری و بەفیڕۆدانی پارە و ساماندا، ناچار باوکی هەوڵی دا ئامۆژگاری کوڕەکەی بکات، بۆ دوورکەوتنەوە لەو هاوڕێیانەی کە گۆرانی بە باڵایدا دەڵێن بەمەبەستی دەستخستنی پارەوپوول و ڕابواردن بە سامانەکەیەوە، بەڵام ئەم کوڕە هیچ بایەخێکی بۆ ئامۆژگارییەکانی باوکی دانەنا، بەڵکو پێی وابوو ئامۆژگارییەکانی باوکی لەترسی ئەوەیە کە لە پارە و سامانەکەی کەم ببێتەوە، هاوڕێکانیشی بەردەوام تاویان دەدا لەسەر خراپە و، بەو وتانە فریویان دەدا کە باوکی پیاوێکی چرووکە و، پارەخۆشەویستە و، بەئەندازەی خەمخۆری بۆ سامانەکەی گوێ بە ئاسوودەیی کوڕە تاقانەکەی نادات.

کاتێك باوکی ئەم هەڵوێست و بەرپەرچدانەوەیەی لە کوڕەکەی بینی، کە هیچ نرخێك بۆ ئامۆژگارییەکانی دانانێت، خەم و پەژارەیەکی زۆر دایگرت و، دووچاری نەخۆشییەك هات، کە بەهۆیەوە بووە کەفتەکاری سەر جێگە.

کاتێك ئەم باوکە دەردەدارە هەستی کرد وادەی مەرگی نزیکبووەتەوە و، ئەم نەخۆشییە کۆتایی ژیانی ئەم دنیایەیە بۆ ئەو، ناردی بەدوای کوڕە تاقانەکەیدا تا بێت بۆلای. کاتێك هاتە لای پێی وت: "ڕۆڵەگیان! خۆت دەزانیت لەم ژیانی دنیایەدا جگە لە تۆ هیچ کەسێکی تر شك نابەم، هەموو ئەو سامانەش کە تا ئێستە

کۆمکردووەتەوە، هەمووی بۆ تۆ بەجێدێڵم، لەبەرئەوە وەسیەتێکت بۆ دەکەم، بەڵام دەبێت پەیمانم پێبدەیت کە هەرچییەك بێت جێبەجێی بکەیت و، سوێندم بۆ بخۆیت و دڵنیام بکەیت لەوەی گوێڕایەڵم دەبیت".

کوڕەکە وتی: "وەسیەتەکەم بۆ بکە، منیش پەیمانت پێدەدەم کە ئەوپەڕی توانای خۆم بخەمەکار بۆ جێبەجێ کردنی".

باوکەکە وتی: "ئەگەر هەموو دەستمایە و داهاتەکانی بازرگانییەکەت لەدەست دا و، هەموو هاوڕێکانیشت دەستبەردارت بوون و، دۆستەکانیشت دەوریان چۆڵ کردی و، چیتر هیچت بۆ نەمایەوە جگە لەم خانووە، ئەوا بە هیچ جۆرێك ئەم خانووە نەفرۆشیت، بەڵکو گوریسێك بهێنە و بە ئەڵقەکەی سەقفی ئەم ژوورەوە گرێی بدە و، خۆتی پێ هەڵبواسە".

کوڕەکە بەم وەسیەتەی باوکی سەری سوڕما، بەڵام باوکی دڵنیاکردەوە و پێی وت: "بابە، خەم مەخۆ، من هەرگیز ناچار نابم کارێکی ئاوا بکەم"، پاشان خواحافیزی لە باوکی کرد و، بەجێی هێشت و، چوو بنوێت.

لە بەیانی ڕۆژی دواتردا کوڕەکە ویستی باوکی بێداربکاتەوە، بەڵام واقی وڕما، چونکە بینی باوکی کۆچی دوایی کردوە، بۆیە خۆی

گەیاندە دەرەوە و، هاواری کرد تا خەڵکی بێن بەدەمیەوە، دۆستان و نزیکان هاتن بەهانایەوە و، سەرەخۆشییان لێکرد و دڵنەواییان کرد.

هەرئەوەنــەی مەراسـیمی ناشـتن و پرسـە تـەواوبوون و، چـەند ڕۆژێك بەسەر مەرگی باوکیدا تێپەڕی، ئەم کوڕە گەڕایەوە سەر خووی ڕابــواردن و کارەخراپـــەکانی و، هـــاودەمیی کردنـــەوەی هـــاوڕێ خراپـەکانی، هـەروەها دەسـتی کـردەوە بـە زیادەخـەرجیی پـارە و سامان.

چەند ساڵێك تێپەڕین و، ئەم گەنجە هەر لەسەر کەمتەرخـەمیی و دەسـتبڵاوی بـەردەوام بـوو، تـا لـەناکاو خـۆی بـە دەسـتبەتاڵی و مایەپووچی بینیەوە و، تەنها ئەو خـانووەی بەدەسـتەوە مایـەوە کـە تیایدا دەژیا؛ چـونکە هەنـدێك لـە سـەرمایەکەی بـە زیـان لەدەسـتدا، تەنانەت کەلوپەلەکانیشی لەپێناو ئەو خووەخراپانەیدا فرۆشت.



پاش ئەم مایەپووچبوونەی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لەماڵەکەیدا مایەوە، بێ ئەوەی هیچ یەکێك لە هاوڕێ و هاودەمەکانی سەردەمی سەرکەشیی و ڕابواردن لە دەرگای ماڵەکەی بدەن و بەسەری بکەنەوە، بەڵکو بەجۆرێك فەرامۆشیان کرد وەك ئەوەی کە هەر نەشیانناسیبێت و، هەریەکەیان سەرقاڵبوون بە ژیانی خۆیانەوە، تەنانەت کاتێك داوای هاوکاری لێکردن بێ وەفاییان نواند بەرامبەری.

لەم کاتەدا هەستی کرد کڵپەیەکی ئاگر بەربووەتە ناخی و، خەریکە دڵی دەسوتێنێ، بەمەش بیری وەسیەتەکەی باوکی

کەوتەوە، بەم شێوەیە ئەوپەڕی ئاواتی ئەوەبوو باوکی بگەڕێتەوە بۆ ژیان، تا ئەمیش ببێتە نەوەیەکی چاك و گوێڕایەڵ بۆی!! بەڵام تازە کار لەکارترازابوو: ﴿لَيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلا أَمَانِيِّ أَهْلِ الْكِتَابِ مَن يَعْمَلْ سُوءاً يُجْزَ بِهِ...﴾ النساء:١٢٣، واتە: (چوونە بەهەشت و بەختیاری لە ڕۆژی قیامەتدا نە بە ئارەزووی ئێوەیە و نە بە ئارەزووی گاور و جولەکەکانە و نە بە قسە و گەزافی موشریکەکانە. نەخەیر بە قسەی کەس نییە بەڵکو هەرکەس خراپە بکات لێی دەپرسرێتەوە و تۆڵەی لێ ئەسەنرێ)...

بەم شێوەیە تەنها هێندەی بۆ مایەوە کە پەتێکی هێنا و، بە ئەڵقەی سەقفی ژوورەکەیەوە هەڵی واسی و، وەرەقە و قەڵەمێکی هێنا و لەسەر وەرەقەکە نووسی: "ئەمە پاداشتی کردارەکانی خۆم و، هاوڕێیەتیکردنی کەسانی خراپ و، شوێنکەوتنی هەوا و ئارەزووەکانمە".

پاش ئەمە چووەسەر کورسیەك و، پەتەکەی لە ملی خۆی ئاڵاند و، بەڕشتنی فرمێسکی پەشیمانی وماڵئاواییکردن لە دوا ساتەکانی تەمەنی، پاڵی بە کورسیەکەی ژێر پێیەوەنا و، پەتەکە بەتەواوی گیر بوو لە گەردنی و، بە سەقفی ژوورەکەوە هەڵواسرا. لەو ساتەدا شریتی ڕووداوەکانی ژیانە پڕ لە سەرکەشییەکەی هاتەوە بەردیدەی..

بـەلآم ئەلْقـەی سـەقفەکە هەلْکەنـدرا و، گوريسـەکە بەشـێك لـە ڕووپۆشی سەقفەکەی لەگەلْ خۆیدا هەلْکەند، بەمەش لێشاوێك لـیرەی زێڕ لە سەقفەکەوە بەربوویەوە، کوڕەکەش وای زانی خەون دەبینێت، بەلآم دواتر دلْنیابوو کە ئەوەی ڕوویدا خـەون نـەبوو، پاشـان دەسـتی خسـتە نێـو لـیرە زێڕینەکانـەوە، تـا دەسـتی بـەر پارچـە کاغـەزێکی زەردی زێـڕین کـەوت و، بـە سەرسـوڕمانەوە پارچـە وەرەقەکـەی هەلْگرت و، بینی تیایدا نوسراوە:

"ڕۆلْەگیان، من دلْنیابووم کە حالْت دەگاتە ئەم حالْەی ئێستەت، چـونکە ژیـان زۆر شـتمان فێـر دەکـات، دەشمزانـی ناچـاردەبیت وەسیەتەکەم جێ بەجێ بکەیت، چونکە تۆ نەوەی خۆمیت و، هەسـت بە ڕاز و خورپـە و خەیالآتـەکانت دەکـەم، بۆیـە لـە ناخمـدا دەمزانـی ڕۆژێك ژیری و هۆشیارییەکەت بۆ دەگەڕێیەتەوە، چـونکە هەریـەك لـە ئێمە ڕەچەلْەکێکی هەیە کە بۆی بگەڕێتـەوە، تـۆش لـە ڕەچـەلْەکێکی پـاك و بێگـەردیت.. وا پـارە و سـامانەکەت بـۆ گەڕایـەوە، کەواتـە سەرلەنوێ ژینێکی نوێ دەست پێبکـە و، نـاو و شـۆرەتی بـەئابڕوو و شـکۆمەندی خێزانەکـەشمان لـەنێو خەلْکیـدا زیندوویکـەوە، ببـەرە باشترین بازرگـان و، باشـترین ئامۆژگاریکـاری منـدالْ و نـەوەکانت لـە ڕۆژانی داهاتوودا.

## داوای شتی (خێر و چاك)ە كردن لە پەروەردگار (الإستخارة):

وتراوە: "ئەو كەسەی ڕاوێژ بە كەسانی دیكە دەكات هەرگیز پەشیمانیی ناچێژێت و، ئەو كەسەش داوای خێروچاكە لە پەروەردگار دەكات و كارەكانی دەداتە دەست خوای گەورە ئەوا هەرگیز بێچارە و هیوابڕاو نابێت".

جابر (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا ﷺ فێری ئیستیخارەی دەكردین لە هەموو كارەكاندا، وەك چۆن سوورەتێكی قورئانی فێردەكردین و، دەیفەرموو: "ئەگەر كەسێكتان ویستی هەر كارێك ئەنجام بدات، ئەوا با دوو ڕكات نوێژی سوننەت ئەنجام بدات و، بڵێت: "اللهم إني أستَخيرُكَ بِعِلْمِك، وأسْتَقدِرُك بِقُدْرَتِك، وأسألُكَ مِن فضلِكَ العظيم، فإنَّكَ تَقْدرُ ولا أقْدِر، وتعْلَمُ ولا أعلَم، وأنتَ علاّمُ الغيوب. اللهمَّ إن كنتَ تعْلَمُ أنَّ هذا الأمر خيرٌ لي في ديني ومَعاشي وعاقبَة أمري، – أو قال: في عاجلِ أمري وآجِلِه– فاقْدِرْه لي. وإن كنْتَ تعْلَمُ أنَّ هذا الأمرَ شرٌّ لي في ديني ومعاشي وعاقبة أمري – أو قال: في عاجلِ أمري وآجِلِه– فاصْرِفْهُ عنّي واصرِفْني عَنْه، واقْدُر لي الخير حيثُ كانَ ثمَّ رضِّني به"، پاش خوێندنی ئەم نزایە ناوی ئەو كارە ببات كە دەیەوێت ئەنجامی بدات.[1]

---

[1] – صحيح البخاري، حديث: ١١٢٦.

ئـەم ڕێگەیـە یەکێکـە لـە ڕێگـە تـاقیکراوە و سـەرکەوتووەکانی هەڵبـژاردنی هاوڕێیـان، چـونکە ئەگـەر پەیوەندییەکـەت لەگـەڵ ئـەو کەسـەی بـەنیازیت بیکەیتـە هـاوڕێ خێـری تێـدابێت بـۆت، ئـەوا بەدڵنیاییەوە خواستەکەت دێتەدی؛ بەڵام ئەگـەر خێـری تێـدا نـەبێت، ئەوا باشتروایە ئەو کەسە نەکەیتە هاوڕێ.

کاتێك دەڵێین خێر لەو هاوڕێیەتییەدا نییە، مەبەستمان ئەوەنییە ئەو هاوڕێیە خراپە، بەڵکو مەبەسـت ئەوەیـە هاوڕێیەتییەکـە سـوود و خێـری تێـدانابێت بـۆ هـیچ کامتـان و، پـاش ماوەیـەك هـەردووکتان سـەرقاڵی کاروبـاری خۆتـان دەبـن و، هاوڕێیەتییەکـەتان تـەنها پەیوەندییەکی کاتیی و ڕووکەشیانە دەبێت.

## نزاو پاڕانەوە:

هەوڵ بدە هیچ ڕۆژێکـت بەسـەردا گـوزەر نـەکات، بـێ نزاکـردن و پاڕانەوە لە خوای گەورە، تـا هـاوڕێی باشـت بێنێتـە ڕێ، هاوڕێیـەکی باش و، دڵسۆز و، ڕاستگۆ، کە ڕێنموویت بکات بەرەو کـاری چـاکە و، ڕێگریت لێ بکات لە ئەنجامدانی کاری خراپەدا.

## هەڵبژاردنی پێشەوایەك لەنێو دەستەی هاورێیاندا:

لەڕاستیدا سوننەتە هەر دەستە و کۆمەڵێکی خەڵك پێشەوا و زمانحاڵێك بۆخۆیان دیاری بکەن، بۆئەوەی ناکۆکی نەکەوێتە نێوانیان و، گرفتاری بۆسە و پیلانەکانی شەیتان نەبن.

بەو پێیەی پێویستە کەسێك زمانحاڵی دەستەکە بێت.. کەواتە بۆچی ئێوەی هاورێیان لەنێو خۆتاندا هەڵبژاردن بۆ سەرکردەیەك ئەنجام نادەن؟ دەکرێت ماوەی پێشڕەوییکردنەکەی بۆ یەك یان سێ یان شەش مانگ بێت و، دواتر هەڵبژارنێکی نوێ ئەنجام بدرێتەوە بۆ هەڵبژاردنی پێشەوایەکی نوێ.

## کۆبوونەوەی خولی:

لە سوودەکانی ئەم کۆبوونەوانە: ئاگاداربوونە لە بارودۆخ و دوایین ڕووداوەکانی ژیانی هاورێیان، ئەمەش بە مەبەستی سوودوەرگرتنی زیاتر لە ئەزموونەکانی یەکتر و، گۆڕینەوەی زانیاری و شارەزاییەکان.

## سازدانی چالاکییە خولییەکان:

کارێکی باشە گەر پێشبڕکێ و سەردانی مەیدانی سازبدەن بۆ یەکێك لە نەخۆشخانەکانی منداڵان، یان بەشداری لە چالاکییەکانی یەکێك لە کۆمەڵە و دەزگا و ڕێکخراوەکاندا بکەن.



## پلەبەندی بۆ هاوڕێکانت بکە:




ژیان کارکردنە، هەروەك چۆن لە کارەبازرگانییەکاندا داهات و خەرجی و سەرمایە و قازانجەکان هەژماردەکەین، مرۆڤیش بە هەمان شێوە پەیوەندییەکانی ڕێك دەخات و، خەڵکی پۆلێن دەکات، بۆنموونە هەندێك کەس بەهۆی پەیوەندی خێزانییەوە دەناسێت و، هەندێکی تر لەڕێی قوتابخانەوە، هەندێکی دیکەش بەهۆی پیشەکەیەوە و ... هتد.

هاوڕێیەك وەك خۆراك وەهایە و، ناکرێت دەستبەرداری ببێت، هاوڕێیەکی تر وەك مار وایە و لێ نزیك بوونەوەی بەهەرشێوەیەك زیانت پێ دەگەیەنێت، بەڵام دەکرێت سوود لە ژەهرەکەی وەربگیرێت، هاوڕێیەکی تر تەنها لەکاتی پێداویستیدا مامەڵەی لەگەڵ دەکەی، هاوڕێیەکی تر و هاوڕێیەکی تر...

بەم شێوەیە مرۆڤ هاوڕێکانی ژیانی پۆلێن دەکات و، جۆری هاوڕێکان دەستنیشان دەکات، تا پەیوەندییەکانی لەسەر ئەو بنەما و گریمانانە بونیاد بنێت، کە لە سایەیدا ئاسوودە و خۆشحاڵ بێت.

## جوانی باخچە بە فرەچەشنی گوڵەکانی دەبێت:

گەر سەردانی باخچەیەکی جوان و ڕازاوەی لێوانلێو لە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ بکەیت، بە چاوەکانت تام و چێژ لەو هەموو ڕەنگە ناوازە و جوانانە دەبینێت کە پەروەردگار بەدی هێناون و، هەست بە ئاسوودەیی و بەختەوەری دەکەیت.



بەڵام بیهێنەرە پێش چاوت: ئەگەر گوڵەکانی ئەو باخچەیە هەموویان یەك ڕەنگ و بۆنیان هەبووایە و یەك جۆر بوونایە، بڕوام وایە لەوکاتەدا کەمتر چێژت لەو دیمەنە دەبرد، پاشان ئەم یەك ڕەنگییە باڵی بەسەر هەستتدا دەکێشا و، دووچاری جۆرێك لە بێزاری

دەبوویت.. لەبەرئەوە بەگشتی دەبینین ئەم چەند جۆرە کەسێتیانەی خوارەوە لەناو هەموو کۆمەڵە هاوڕێیەکدا بوونیان هەیە:

- **گاڵتەباز و سوعبەتچی:** ئەو کەسەی کە وشەکانمان دەگۆڕێت بۆ نوکتەی پێکەنیناوی.

- **خاوەن ئەزموون:** کە لێوانلێوە لە ئەزموون و شارەزایی و سوودی لێ دەبینین.

- **دڵپاك:** بەسۆز و پشتیوانە بۆ هەرکەسێك دووچاری گرفت و نارەحەتیەك هاتبێت.

- **لەخۆبایی:** کەسێکە فێرمان دەکات چۆن لەگەڵ کەسانی هاوشێوەیدا ڕەفتاربکەین.

- **توندوتیژ و بازوودار:** لەکاتی پێویستدا کەسێکی هاوکارە.

- **ڕۆحانی:** ئەو کەسەیە ئامۆژگاریمان دەکات و ڕێنماییمان پێدەدات.

- **ئارەزووباز:** بزوێنەری حەز و ئارەزووە دنیاییەکانمانە و، دنیامان لا خۆشەویست دەکات.

- **بیریار:** ژیریمان دەپارێزێت لە سەرگەردانی.

- **کارکەر و چالاك:** بە جوڵە و چالاکییەکانی هاوکاریمان دەکات بۆ سازاندنی کەشێکی پڕ لە کەیفخۆشی.

- **ڕۆمانسی:** هێمنی و ئارامی دەبەخشێتە دڵ و دەروونمان.

- **دڵسۆز**: دێتە نێو کاروبارەکانمانەوە، بۆئەوەی هەست و ئارەزووە خراپەکانمان لێ دووربخاتەوە و، لە دووبەرەکی بمانپارێزێت.

- **سەرکردە**: ئەو کەسەیە کە بەردەوام فەرمانی یەك لەدوای یەکمان بەسەردا دەدات، کوردوتەنی: (خوا داینەوە فەرمان دەرکات).

- **فەیلەسوف**: رێکخەری دەستەواژەکانە بۆ ئەو بیرۆکانەی کە دەکرێت بیان کەین بە کتێب.

چەندین جۆری دیکەی هاوڕێ جگە لەم جۆرانە هەیە، لە کۆتاییشدا هەر کەسە و لەنێو هاوشێوەکانی خۆیدا هاوڕێ دەگرێت...

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَى شَاكِلَتِهِ...﴾ الاسراء:٨٤، واتە: (تۆ بڵێ: هەرکەس لەسەر ڕەوشت و مەزاج و عادەتی خۆی ئیش ئەکات و ئەجووڵێتەوە).

پێشینانیش وتوویانە: "مەنجەڵ بۆ سەرقاپی خۆی دەگەڕێت".



## هاوڕێکانت بدۆزەوە



بەو شێوازە قایل مەبە، کە بەشێوەیەکی هەڕەمەکی و بەڕێکەوت و بێ بەرنامە هاوڕێکانت بدۆزێتەوە، بەڵکو بە بەکارهێنانی زانست و هونەرەکانی شیکاری کەسیەتی هاوڕێ بگرە، بەپێی ئەو توێژینەوە و لێکۆڵینەوانەی ئەنجامم داون، زیاد لە (١٢٠) زانست و هونەر و ڕێگە هەن، بۆ پەیبردن بە واتا و سروشت و سیفەتەکانی کەسێتییە جیاوازەکان.

پێم وایە تۆش لەگەڵ مندا هاوڕای لەبابەتی (فرەجۆریی مرۆڤ بەچەشنی کانزاکان)، بەدڵنیاییەوە مرۆڤەکان بەوشێوەیەن، چونکە خوای گەورە هەموومانی لە خاك و خۆڵ بەدیهێناوە، کانزاکانیش لە خاکەوە دەردەهێنرێن.

مرۆڤی وا هەیە سروشتی پێکهاتەکەی وەك (زێڕ)ە، ژەنگ ناکات و، بە تێپەڕبوونی کات گۆڕانی بەسەردا نایەت، سەرەڕای هەموو ئەو جیاوازییەی لەگەڵ هاوڕێکانیدا بۆی دروست دەبێت و، ئەو سەختیی و ناڕەحەتیانەی تێپەڕ دەبێت پێیدا.

دەبینین کەسێکی تر سروشتی پێکهاتەکەی وەك (ئاسن) وایە، بەردەوام بە ڕەقی و بەهێزیی لەنێو هاوڕێکانیدا ئامادەیە، هی واش

هەیە سروشتی پێکهاتەکەی وەك (مس)ە و بێ باریی زاڵە بەسەر زیانیدا و، هەر ڕۆژەی بەجۆرێکە، مرۆڤێکی تر سروشتی پێکهاتەکەی وەك قسڵاوە و سیفەتی بەخشندەیی و هەست ناسکی تێدا بەدی دەکرێت، جگە لەمانەش جۆری دیکەمان زۆرە، کە من لەم کتێبەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەم.

کەواتە باشتر وایە ئەو بنەمایانە پەیڕەوبکەیت، کە لەم کتێبەدا دیاریمان کردوون، بۆئەوەی -بە پشتیوانی خوای گەورە- هاوکارت بن بۆ بەستنی پەیوەندی هاوڕێیەتیی سوودبەخش و بەسوود..

لەبەرئەوە کاتێك بەهۆی ڕێنماییەکانی ئەم پەرتووکەوە ئاشنا دەبیت بە سیفەتەکانی کەسێتی هاوڕێکەت، با ماوەیەکی زۆریش بێت هاوڕێت بووبێت، سوودمەند دەبیت و زیاتر هاوڕێکەت دەناسیت، خۆ ئەگەر خوازیاربیت پەیوەندی هاوڕێیەتی لەگەڵ کەسێکدا ببەستیت، ئەوا باشتر وایە بە شێوەیەکی خێراتر ئاشنا ببیت بە سیفەتەکانی، کە دەتوانیت لە تەنها دانیشتنێکیشدا ئەم کارە بکەیت، بەوپێیەش بڕیار دەدەیت کە ئایا جارێکی تر چاوت پێیبکەوێتەوە تا پەیوەندییەکەتان بەهێزتربکەن و، لەنزیکەوە ئاشنا ببیت بە کەسێتیی، یاخود لەیەکەم چاوپێکەوتنتانەوە بڕیار دەدەیت کە هاوڕێیەتی نەکەیت.

## گەڕان بەدوای هاوڕێدا:

مرۆڤ بە سروشتی خۆی کۆمەڵایەتییە و، ئارەزووی تێکەڵبوون و چاوپێکەوتن و هاوڕێیەتی کردنی کەسانی دیکە دەکات و، ئاسوودە دەبێت بە بینینیان، تەنانەت زوو ڕادێت لەسەر هاودەمیکردن و تێکەڵاوییان، لەبەرئەمە پێویستە هاوڕێیەکی هەبێت خۆشی بوێت و هۆگری ببێت، یاخود بەشێك بێت لە کۆمەڵ و دەستەیەك هاوڕێ، کە وەك هەڵبژاردنی خۆشترین و جوانترینی بەروبومەکان هەڵیانبژێرێت، پاشان لە ئاست ئەرك و مافی هاوڕێیەتی و جوان مامەڵەکردن لەگەڵیاندا کەمتەرخەمیی نەکات.

* دەزانێت ئەرکی سەرشانی چییە و، لەلایەن بەرامبەرەکەشیەوە هاوڕێیەتیەکی باشی دەست دەکەوێت...

### پرسیارە ئەفسووناوییەکان بۆ پەیبردن به تایبەتمەندیی کەسێتییە جیاوازەکان:

* پرسیاری یەکەم: باشترین ئاژەڵی ماڵیی لای تۆ چییە؟



وەڵامی کەسەکە ئاماژەیەکە بۆ خودی کەسێتیی ڕاستەقینەی.

* پرسیاری دووەم: کام ئاژەڵی دڕندە

سەرنجت ڕادەکێشێت؟

وەڵامەکەی ئاماژەیە بۆ ئاستی بەهێزیی...

* پرسیاری سێیەم: کام باڵندەت لا خۆشەویستە؟

وەڵامەکـەی ئاماژەیـە بـۆ جـۆری ئـەو پەیوەندیانـەی کـە لای پەسەندە..

* پرسیاری چوارەم: کام ئاژەڵی خشۆکت لا پەسەندە؟

وەڵامەکەی ئاماژەیە بۆ ئاست و پلەی پیلانڕێژیی و فێڵبازیی..

* نموونـــەی وەڵامێـــك: ئەگـــەر کەســـێك بـــەپێی ڕیزبەنـــدیی پرسیارەکان بەمشێوەیە وەڵامی دایتەوە: (کەروێشك و، شێر و، هەڵۆ و، مار)... ئەوا لێکدانەوەی کەسێتیی بەم شێوەیەیە: کەسێکی بە فرت و فێڵە و، خۆهەڵکێشە و شانازی بەخۆیەوە دەکات، بوێرە و، وریایـە بـۆ پلانـدانان، ئـارەزووی تاقیکردنـەوە و هەڵســەنگاندن و هەڵبژاردنی هاوڕێکانی دەکات و، زۆر ڕادەمێنێت و، دانایە و، تەنها بۆ خۆپارستن و لە کاتی پێویستدا ئازاری کەسی بەرامبەر دەدات.

## شیکاری کەسێتی لە ڕێگەی (ناو)ەوە،

### (هەموو کەسێك تاڕادەیەك بە ناوەکەی کاریگەرە):

بەڕاستی پرسیارکردن لەبارەی ناوی کەسێکەوە کە بۆ یەکەمین جارە چاوت پێی دەکەوێت هەڵوێستێکی زۆر قەشەنگ و هاوچەرخە،

هەروەها پێویستە تۆش ناوی خۆتی پێ ڕابگەیەنیت، چونکە (ناو) کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر خەڵکی هەیە، وتراوە: (هەموو کەسێك تا ڕادەیەك بە ناوەکەی کاریگەرە).

مرۆڤ لە ماوەی تەمەنیدا تاڕادەیەك کاریگەری ناوەکەی ڕەنگدانەوەی لەسەر ژیانی دەبێت، تەنانەت ناوی مرۆڤ گوزارشتە لەو ژینگەیەی خاوەن ناوەکە تیایدا لەدایك بووە و، ئاماژەیە بۆ ئاستی بژێوی و شێوازی بیرکردنەوەیان، چونکە خێزان چەندین ڕۆژ و چەند مانگ دەگوزەرێنێ تا ناوێك هەڵبدەژێرێت کە بەرجەستەی کۆمەڵێك واتا و بەهای مەعنەویی بکات.

عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕازی بێت) ئامازەی بەوە کردووە، کە منداڵ مافی ئەوەی هەیە کە لە بنەڕەتدا باوکی دایکێکی باشی بۆ هەڵبژاردبێت، پاشان ناوێکی خۆش و جوانی بۆ هەڵبژێرن و، بە پەروەردەیەکی جوان و تەندروست گۆشی بکەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ناوێکی جوانی لا پەسەند بوو، بەڵام دژی ناونانی منداڵ بوو بە ناوەکانی سەردەمی نەفامی. تەنانەت ئەو ناوانەشی دەگۆڕی کە مۆرکی ئەو سەردەمەیان پێوەبوو.

لە ژیاننامەی نوورینی پێغەمبەرداﷺ هاتووە، کە ناوی کچەکەی ئومو سەلەمەی گۆڕیوە، کە لە ماڵەکەی خۆیدا پەروەردە بوو و، ناوەکەی گۆڕی بە (زەینەب)، لەکاتێکدا خۆی ناوی (بِرَّة) بوو، چونکە

وتـراوە ئـەم نـاوە واتـای (خۆبەچـاکزانین)ی داوە، پێغەمبـەریش ﷺ فەرموویـەتی: (لا تزكـوا أنفسـكم ، الله أعلـم بأهـل الـبر مـنكم) واتـە: (وەسفی خۆتان مەکەن، خوای گەورە زاناترە بە چاکەکارانتان).[1]

هــەروەها نـاوی (عاصـیە)ی گۆڕیـوە بە(جەمیلـە)، (حــەرب)ی گۆڕیوە بە(حەسەن) و زۆرێکی تر....

بۆ زیاتر سودمەندبوون لەم بابەتە دەکرێت سود لە خوێندنەوەی کتێبی (ناولێنانی منداڵ) وەربگیرێت .

## شیکاری کەسێتی لە ڕێگەی دەستخەتەوە:

مــرۆڤ هــەر لــەقۆناغی منداڵییــەوە یاســاکانی خۆشنووســیی فێردەکرێت، بەڵام هەر مرۆڤێك بـەپێی سروشـت و کەسـێتی تایبـەتی خۆی دەنووسێت.

[1]– صحيح مسلم، حديث: ٤٠٨٦.



دەستخەتی مرۆڤ ئاماژەیە بۆ چەند لایەنێکی گرنگ لە کەسێتیی، دیارترینیان:

– لاربوونەوە و ئاراستەی خەتەکە، واتە لاربوونەوەی خەتەکە ڕووەو ئاراستەی نووسین یان بە ئاراستەی پێچەوانەیەوە، لەسەر هێڵی ئاسۆیی و دێڕەکانی نووسین.

– قەبارەی خەت لە هۆکارە گرنگەکانی جیاکەرەوەی کەسێتییە، مەبەست لە قەبارەی خەتیش دووری نێوان بەرزترین خاڵی پیتی نووسراوە لەگەڵ نزمترین خاڵی پیتەکەدا، کە ئەمەش ئاماژە بە کەسێتی خاوەن دەستخەتەکە دەکات.

- هەروەها پەستان خستنە سەر قەڵەمی نووسین لەسەر کاغەزەکە کاریگەری لەسەر کەسێتی خاوەن خەتەکە هەیە.

## شیکارکردن لە ڕێگەی زمانی جەستەوە:

کۆمەڵێك ئاماژە هەن، کە بیرۆکەیەکمان لەبارەی زمانی جەستەوە لا گەڵاڵە دەکەن و، دەتوانرێت لە دەرخستنی پتەویی و بەتوانایی کەسێتی بیسەردا بەکاربهێنرێت، هەروەها لە زانینی ئەوەی کە کەسانی دیکە بیری لێ دەکەنەوە، یا زۆریش هەوڵبدەن بیشارنەوە.

لەڕاستیدا دەتوانیت لەڕێگەی جموجۆڵە فیزیکییەکان (جەستەییەکان)ی خەڵکییەوە لە کەسێتییان تێبگەیت، ئەمەش لەڕێگەی:

١- چاو

٢- برۆ

٣- لووت و هەردوو گوێ

٤- نێو چاو

٥- شانەکان

٦- پەنجەکان

٧- باڵەکان

## نۆ جۆرەکەی هاوڕێ

ژمارە (١) یەکەمین ژمارەی دروستە و، یەکەمین ژمارەیە کە هیچ ژمارەیەکی تری لەگەڵدا نییە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ژمارەی تری بەدوادا دێت، کە بریتییە لە (٢) و، دوای ئەم ژمارە (٣) دێت، پاشان (٤) و، پاشان (٥) و، دواتر (٦) و، دوای ئەو (٧) و، دوای ئەو (٨) و، پاشان (٩) و، دواتر (١٠).

بەڵام ئەگەر هەڵوێستە بکەین و تەنها ئەو ژمارانە لەبەرچاوبگرین کە یەکەیەکی تەنهان و هیچ ژمارەیەکی تریان لەگەڵدا نییە، ئەوا لە ژمارە (٩)دا دەوەستین، لەڕاستیدا هەموو ژمارەکانی تر هەرچەندە گەورەبن لە بنەڕەتدا هەر لەم (٩) ژمارەیە پێکدێن، ئەمەش ڕێکەوت نییە، چونکە ژمارە (١٠) دەمانگێڕێتەوە بۆ ژمارە (١)، ئەوەتە (١+٠=١)، بەڵام ئەگەر ژمارە (١١) بێنین دەمانگێڕێتەوە بۆ ژمارە (٢) واتە (١+١=٢) و، بەمشێوەیە بۆ هەموو ژمارەکانی تر، تەنانەت ئەگەر بڵێین (٣٤٥) ئەوا ئەم ژمارەیە دەمانگێڕێتەوە بۆ ژمارە (٣) واتە (٥+٤+٣=١٢) کەواتە (٢+١=٣).

لە سەردەمانی ڕابردوودا دانا و بیریارەکان ژمارە ئازادەکانیان قەبڵاند، کە بریتین لەو نۆ ژمارەیە، چیرۆك خوانەکانیش چەندین

چیرۆك و ڕۆمان و سەرگوزشتەیان سەبارەت بە نۆ كەسێتییە بنەڕەتییەكە دارشتووە، لەڕاستیدا ئەمە تەنها تیۆرێكە و، زانایان بە تێپەڕبوونی كات برەویان پێداوە و، لەئەنجامدا بیرۆكەی (نۆ كەسێتیەكە)یان چەسپاند.

منیش پێی دەڵێم (پێنج وزەكە و نۆ گۆڕانكاریەكەی) و، تەواوی زانیارییەكانم سەبارەت بەم كەسێتیانە نەخستووەتەڕوو، بەڵكو هەوڵمداوە ئەو زانیارییانەت بۆ ڕوونبكەمەوە، كە تۆی خوێنەر پێویستت پێیەتی بۆ ئاشنابوون بە هاوڕێكانت، من تەنها ئەوەم مەبەست بوو، خۆ ئەگەر ئارەزووی دەستخستنی زانیاری زیاتر دەكەیت، ئەوا دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ ئەو كتێبەی كە من وەك سەرچاوەیەك پشتم پێبەستووە.



## یەكەم: كەسێتی (نموونەیی)

كەسێتییەكی ڕوون و بێ پێچ و پەنا و هەست ناسكە، توانای خۆگونجاندنی هەیە لەگەڵ ژینگەی دەوروبەردا، تا ڕادەیەكی زۆر نەرمونیانە، كەسێتییەكی خۆشەویستە لای خەڵك و، خۆشڕەفتارە و مامەڵەكردن لەگەڵیدا ئاسانە، زۆر جار لەكاری نووسین یا شێوە جیاوازەكانی داهێناندا بەشداری دەكات، ئەگەر

لاوازییەك ڕووی تێکرد ئەوە توانـای خۆگونجانـدنی دەگاتـە بـەرزترین ئاست، تەنانەت وەك کەسێتییەکی نـاجێگیری ڕاڕا دێتەپێشچـاو، کـە ناتوانێت بە ڕوونی گوزارشت لە بیروڕا و تێڕوانینەکانی بکات.

ئەم کەسێتییە لە ڕووکاردا پارێزکار و وریا و ڕەوشتبەرزە، بـەڵام لە ناخدا بەهێزە. گوێگرێکی باشە، بەڵام لە زۆربەی کاتەکاندا هەسـتە ڕاستەقینەکانی خۆی دەرنابڕێت و، زۆر لێهاتووە لە پارێزگاریکردن لە نهێنیەکانیدا، خاوەنی بەرچـاوڕوونی و بینـاییـەکی بـەهێزە و، توانـای لێڕوانینی هەیە لەهەموو لایەنەکانی ڕووداوێك یا بابەتێك.

ئەم کەسێتییە ڕەچاوی هەست و سۆزی کەسـانی تـر دەکـات و، ڕەفتارەکانی پلان بۆ داڕێژراون و، تایبەتمەندییـەکانی ڕابـەری تێدایـە و، لە بەستنی پەیوەندییـە کۆمەڵایەتیەکانـدا لێهـاتووە و، گرنگـی بـە کەسانی تر دەدات و، لەناخی خۆیدا هەستی خۆبەگەورەزانینی هەیە، لە قۆناغێکی زوودا گرنگی بە ڕەگـەزی بەرامبـەر دەدات، ئـەوەی ئـەم کەسـێتییە دەبزوێنێـت پێداویسـتیەکانییەتی بـۆ سـازدانی ژیـانێکی سەربەرزانە و دروست، هەوڵدەدات بـۆ باشـترکردنی کەسـێتی خـۆی و باشترکردنی جیهانی دەوری.

ڕەخنـە لـە خـۆی و لـە کەسـانی دیکـەش دەگرێـت، کەسـێکی واقیعبینە و، پێی وایە یـەك ڕێگـە هەیـە بـۆ گەیشـتن بـە حەقیقـەت و کەماڵ لە کارەکانیدا، ئەویش وردەکـاری و جـوان ئەنجامـدانی کـارە،

بڕوای وایە لە کەسەکانی دیکە بەتواناتر و سەرکەوتووترە، بەهۆی پەیڕەوکردنی بنەما و بەها باڵاکانەوە. لە هەڵوێست وەرگرتندا دوادەکەوێت لە ترسی هەڵەکردن.

خاوەنی بیروباوەڕ و بنەمای تایبەتی خۆیەتی و، دان بە شیکردنەوەی هیچ کەسێکدا نانێت بۆ کەسێتیی، چونکە کەسێتییەکی پیشەییە و، پێی باشە وەك کەسێکی ئاڵۆز و پەنهان لێی بڕوانرێت، بە شێوەیەکی گشتی ئارەزووی بەسەربردنی شێوە ژیانێکی شاراوە و نهێنی دەکات.

کەسێتییەکی خۆشڕەفتار و دبلۆماسییە، سەختیی و ناڕەحەتییەکان دەبڕێت، ڕووکاری ژیانی خۆی بە هێواشی بونیاد دەنێت، کاتی تەواو تەرخاندەکات بۆ لێکۆڵینەوە لە بابەتە پەیوەندیدارەکان بەژیانییەوە، لەگەڵ گۆڕانکاری و ڕووداوەکاندا هەڵدەکات، پێویستی ئازادبوون هەستی سەربەخۆیی لا گەڵاڵەدەکات، مامەڵەکانی نهێنین، بابەتە ڕۆحانیی و نائاسایی و ناسروشتییەکان سەرنجی ڕادەکێشن. بایەخدان بە تێرکردنی هەست و ئارەزووەکانی لەڕووی زایەندییەوە وەك پێویستییەکی سەرەکی ژیان دەبینێت.

بایەخ بە هەست و سۆز و ڕۆمانسیەت دەدات، تەنانەت ڕەنگە دووچاری پەیوەندی ئەویندارییی نهێنیش بێتەوە، بەهۆی خێرا وەڵامدانەوەی بۆ ئەم جۆرە بابەتانە. نەرمونیان و خۆشڕەفتارە

لەگەڵ ئەو کەسانەی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، لەبەرئەوە چەندین گرفت و کێشەی دێتەڕێ، بەهۆی دیاری نەکردنی سنوورێك بۆ سروشتی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا، لەگەڵ ئەمەشدا کەسێتییەکە کە دەزانێت چۆن ژیرانە خۆی دەربازبکات لەو گرفتانەی دووچاریان دەبێت.

حەزی لە ڕۆچوونە لە دەریای خەیاڵ و نموونەیی بووندا، لێهاتوویی هونەری هەیە و، داهێنانی لێدەوەشێتەوە.

خولیای لوتکەی نموونەیی بوون دەکات لە هەموو شتێکیدا، لەبەرئەوە کەموکورتی لە هەموو شتێکدا دەبینێت، توانایەکی بەرچاوی لە بەستنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا هەیە.

بەوریایی و لەسەرخۆییەوە ڕێ دەکات و، توانای تێپەڕبوونی هەیە بە شیو و دۆڵی ناخی کەسێتییە جیاوازەکاندا، ڕێبازێکی دیاریکراو لە ژیاندا پەیڕەدەکات و، زۆر پابەندە پێوەی، ڕۆح سووکە و زوو جێی خۆی لە دڵتدا دەکاتەوە، کاتێك قسەی لەگەڵدا دەکەیت سەری وەك ئاماژەیەك بۆ قایلبوونی بە وتەکانت بادەدات، لەسەرخۆیە و، وات لێدەکات گومان بەریت کە هاوڕایە لەگەڵ بیرۆکەکەتدا، بەڵام لە ئەنجامدا هەر ئەوە ئەنجام دەدات کە خۆی دەیەوێت، بە منداڵیی پێی خۆشە یاری و گەمە بە ئاو و هەموو شتێکی شل بکات، پاش پێگەیشتنیش هەر بەو جۆرەیە، بە ئەسپایی

بە ڕێدا دەڕوات و، چالاکە و، بەردەوام هەست بـە مەترسـی دەکات، بەڵام هەمیشە ئامادەیە بۆ سەرکەشیی.

## دووەم: کەسێتی (دڵپاک)

خاوەن دڵێکی پاك و بەخشندەیە، زۆر سینە فراوانـە، توانایـەکی بەرچاوی خۆگونجاندنی هەیە.

بەردەوام چاولەڕێی دەستخستنی هەست و سۆزی خۆشەویسـتی ئەوانی دیکەیە و، خوازیارە خەڵکی خۆشەویستی خۆیانی بۆ دەربڕن و، دڵنیـای بکەنـەوە کـە نـاتوانن دەسـتبەرداری بـبن لـە ژیانیانـدا، تەنانەت ڕەنگە یاری بە هەستەکانی خەڵکی بکات تـا کەمەندکێشیان بکــات بــۆلای خــۆی، ئەمــەش لــە میانــەی خســتنەڕووی چــەند ڕووخسارێکی جیاواز لەکاتی مامەڵـەکردنی لەگەڵیانـدا. خۆشـڕەفتار و دۆستانەیە و، بایەخ بە کەسانی تر و پێداویستییەکانیان دەدات.

خاڵی لاوازی ئەم جۆرە کەسـێتیە لەبارێکـدا کـە خـۆی نەناسـێت ئەوەیە: لەئاست خەڵکیدا خۆی بە گەورەدەزانێت.

بەڵام ئەگەر خۆی بناسێت، خاڵی بەهێزی: خاکیی بوونە.



پێی باشە زۆر بە وردیی هەستی خۆی دەرببڕێیت و، لە هەست و سۆزی کەسانی دیکەش تێدەگات و، ئەوانیش وەك کەسێکی بەسۆز و میهرەبان دەیبینن، بەهۆی ئەمەشەوە ژمارەی هاوڕێکانی زۆرن، کەسێکی ڕۆمانسییە و، هەستی خۆشەویستیی و دڵسۆزیی لە هاوسەر و هاوبەشی ژیانی چاوەڕوان دەکات، لە مامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکیدا سەرنجی بەلای ئەو کەسانەدا دەڕوات کە بە پێچەوانەی سروشتی ئەمەوە ئارەزووی گاڵتەوگەپ و یاری دەکەن. مرۆڤێکی بە گومانە، بەتایبەتی لە هاوسەرەکەی و، ڕەخنەی زۆر لە کەسە نزیکەکانی دەگرێت و، ڕەنگە بەمە هەستیشیان بریندار بکات.

به پشتبەستن بە هەست و سۆزەکانی ئەوە بەرجەستە دەکات کە خەڵکی ئارەزووی دەکەن، بێ گوێدانە ژیری.

داهێنانخوازە و، هەست و سۆزی کەسانی دیکە لەبەرچاو دەگرێت، گوێگرێکی زۆر باشە.

بیرورپا و سەرنجی خەڵکی لا گرنگە و، لە کارەکانیدا چاو لە کەسانی دیکە دەکات، ئارەزووی پشوودان و حەوانەوە دەکات و، هەر کارێکیش ئەنجام بدات، بە ئامانجی پشوودان و حەوانەوەیە لە داهاتوودا.

پەیوەندییە سۆزدارییەکانی بەهەند وەردەگرێت، شایستەی متمانەپێکردنە، هەندێك جار گەمەبازە، تا ئاستی ساویلکەیی دڵپاك و سینەفراوانە.

## سێیەم: کەسێتی (چالاك)



هەمیشە ئارەزوو دەکات بایەخ بە کەسانی دیکە بدات، وریا و بیرتیژە، بیرکردنەوەیەکی داهێنەرانە و بەرهەمدارانەی هەیە.

بەردەوام لەڕێی ئەنجامی کارەکانیەوە خەمخۆری خۆخۆشەویستکردنە لای خەڵکی، هەمیشە لە وێنەی مامۆستاو فێرکار

لەپێش خەڵکیدا دەردەکەوێت، بەجۆرێك کە کاری زۆری ئەنجام دابێت، بەڵام واقیعی ژیانی پێچەوانەی ئەمەیە، چالاکە، گەشبینە، متمانەی بە خۆی و بە گەیشتن بە ئامانجەکانی هەیە.



لەبارێکدا گەر ئەم جۆرە کەسێتییە بەباشیی خۆی نەناسی، خاڵی لاوازی بریتییە لە: دووڕوویی و فێڵبازیی.

بەڵام گەر خوودی خۆی ناسی، ئەوا خاڵی بەهێزی بریتییە لە: ڕێزداری و سەرڕاستی.

ئارەزووی بزاوتن و، ژیریی کردەیی و، ئەنجامدانی چەند پرۆژەیەکە لە هەمان کاتدا، ئامادەیە هەموو تواناکانی بخاتەگەڕ،

لەپێناو ئەوەی هەرچی زووترە ئەنجام و بەرهەم مسۆگەربکات، بەمەش لە دەستەی پلاندانەران بۆ کار دوور دەکەوێتەوە.

بە بەکارهێنانی هەست و سۆز ڕەنگ و شێوەی جیاواز دەنوێنێت بێ گوێدانە ژیری، بۆئەوەی خۆی لەگەڵ ژینگەی دەوروبەریدا بگونجێنێت، ئامادەباشی هەیە بۆ تەواوکردنی ئەوکارانەی پێی دەسپێردرێن.

ئارەزووی ڕۆچوون دەکات لە ئاسۆکانی نموونەیی بوون و خەیاڵدا، بایەخ بە لایەنی ڕۆمانسی دەدات، داهێنانخوازە و، توانای هونەری هەیە.

هەر لە قۆناغێکی زووەوە ئارەزووی پەیوەندی بەستنی هەیە لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەر و، بەهۆی تامەزرۆیی و پەرۆشی بۆ چەشتنی ئاسوودەیی بەهاری خۆشەویستیەوە، تاڕادەیەکی بەرچاو ئارەزووی دەستبەسەراگرتن و جڵەوکردنی کەس و شتەکان دەکات.

پێویستی بە خوێندنی چەندین وانە و ڕاهێنان هەیە لە بارەی ڕێکخستنی هەست و سۆزەکانیەوە، بۆئەوەی دووچاری هەڵە نەبێت.

## چوارەم: کەسێتی (ڕۆمانسی)

ڕێکخەرە و، توانای گەشەپێدانی کەسێتی خۆی و پرۆژە و کاری هەیە. بەردەوام مەراقی دەستخستنی ئەو شتە دەکات کە لە ژیانیدا

خاوەنی نییە، گرفتاری هەستی دڵتەنگی و بێبەشییە، چونکە بڕوای وایە کە لە ژیانیدا هەرگیز بە خواستەکانی نەگەیشتووە، لە داهێنانی هونەریدا دەستێکی باڵای هەیە، بایەخ بە تێبینی و سەرنج و کاریگەربوونی کەسانی تر دەدات و، زۆر هەستیارە.

لەبارێکدا گەر ئەم جۆرە کەسێتییە خوودی خۆی نەناسێت خاڵی لاوازی بریتیە لە: ئیرەیی بردن بە خەڵکی.

بەڵام لەبارێکدا گەر خۆی بناسێت خاڵی بەهێزی بریتییە لە: دادپەروەری و چاکەخوازی.

ئارەزووی گەشتکردن و، تاقیکردنەوەی شتی چاوەڕواننەکراو و نوێ دەکات، لە سەختی و گرفتەکان هەڵدێت و، بەردەوام بەدوی ئەو کارانەدا دەگەڕێت کە ئەنجامدانیان ئاسانە، خوازیارە باسی پیشە و کارەکانی بە هەموو خەڵکی ڕابگەیەنێت، مەراقی دۆزینەوەی هاوبەشێك دەکات بۆ ژیانی، کە بتوانێت هەستی ناسك و جوانخوازیی و ڕۆمانسی گەرموگوڕی ئەم بەرز بنرخێنێت.

هاوخەمی ناڕەحەتییەکانی خەڵکیە و، لەباری دەروونیی سەختیاندا دەژی، بێ گوێدانە ژیریی و بیرکردنەوەی واقیعیانە.

سەرکەشانە کەمەندکێشی ئاسۆکانی جیهانی نموونەیی و خەیاڵ بووە، بایەخ بە بواری سۆزداریی دەدات و، داهێنانخوازە و، خاوەن توانای هونەرییە.

له قولایی ئۆقیانووسی خۆشەویستی و ڕۆمانسیەتدا ڕۆچووە و، له بڕیارداندا دوادەکەوێت و، زۆرێك لەو دەرفەتانه لەدەست دەدات که بۆی دەڕەخسێن.

ئەو ژنانەی که ئەم جۆره کەسێتییەیان هەیە، ئەو جۆره پیاوانه سەرنجیان ڕادەکێشن که ئاستی زانست و ڕۆشنبیریان لەخۆیان بەرزتره.

## پێنجەم: کەسێتی (چاودێر)

توانای خۆگونجاندنی هەیه، قسەزانه، کۆمەڵایەتییه، به پلەی یەکەم دبلۆماسیه، واته هەوڵدەدات گوفتار یا کردارێکی لێ نەبینرێت که زیان له بەرژەوەندییەکانی بدات.

جیهانێکی تایبەت به خۆی هەیه، که بوار نادات هیچ کەس هەنگاو بنێته نێویەوه، هەمیشه سنوور دادەنێت بۆ پەیوەندییەکانی لەگەڵ کەسانی دیکەدا، پێی باشه له دەرەوەی بازنەی دەستەی کارکەران بێت، چونکه خوازیاره گۆشەگیربێت، بەڵام له نزیکەوه چاودێری کارەکانی کەسانی دیکه دەکات، بەڵام هاوبەشییان ناکات، ئارەزووی کۆکردنەوەی زانیاری و شیکردنەوەیان دەکات، خولیای زانین و فێربوون دەکات.

لەبارێکدا گەر ئەم جۆرە کەسێتییە خوودی خۆی نەناسێت خاڵی لاوازی بریتیە لە: چاوبرسێتی.

بەڵام لەبارێکدا گەر خۆی بناسێت خاڵی بەهێزی بریتییە لە: نانبدەیی و هۆگرنەبوون و دەستبەرداربوونی شتە مادییەکان.

توانای هێنانەکایەی گۆڕانکاری پیشەیی و، پێشنیارکردن و پەیڕەکردنی بیرۆکە و پرۆژەی نوێی هەیە، بە سانایی خەڵکی بە بیرۆکە و بنەمای فەلسەفەی ژیانی خۆی قایل دەکات. خوازیارە بەردەوام ئەو کەسانەی لەدەور بن کە خۆشیان دەوێت و، لە نزیکەوە چاودێری هەڵسوکەوتەکانیان دەکات، بە ناسینی کەسێتییە کۆمەڵایەتییەکان خۆشحاڵ دەبێت، لەبەرئەوە خەڵکی متمانەی پێدەکەن و، نهێنییەکانی خۆیانی لا دەدرکێنن.

لە هەست و سۆزەکان خۆی بەدووردەگرێت، بۆئەوەی بێ لایەنانە چاودێری هەڵوێستەکانی کەسانی دیکە بکات.

داهێنانخوازە و، هەست و سۆزی کەسانی دیکە لەبەرچاودەگرێت، وەك گوێگرێکی باش و هۆشدار ناسراوە.

خۆی لە چەندین کار و باسی نائاساییەوە دەگلێنێت، بەشێوەیەکی ناجێگیر هەست و سۆز بۆ کەسانی دیکە دەردەبڕێت، خولیای خاوەنداریێتیی و جڵەوکردنی کەسانی دیکە دەکات، لە پەیوەندییەکانیدا کەسێکی دڵسۆزە.

## شەشەم: کەسێتی (دڵسۆز)

شایەنی متمانەپێکردنە، تێڕوانینەکانی ڕەشبینانەن، هاودەمیی و لایەنگیریی لاواز و بێدەسەلاتان دەکات و، بەرەنگاری هەموو جۆرەکانی ستەمکار و خۆسەپێنەران دەبێتەوە، هەست بە بەرپرسیاریەتی دەکات و، پێیوایە پێویستە لەپێناو هەندێك دۆز و بابەتدا بکۆشێت، گرنگترین خاڵی ژیانی دڵسۆزیە بۆ خێزان و، کەسوکار و، هاوڕێیان، بە چەندین شێوازی جۆراوجۆر یا دژبەیەك گوزارشت لە ناخی دەکات.

لەبارێکدا گەر ئەم جۆرە کەسێتییە خوودی خۆی نەناسێت خاڵی لاوازی بریتیە لە: ترس

بەڵام لەبارێکدا گەر خۆی بناسێت خاڵی بەهێزی بریتییە لە: ئازایەتی و جوامێریی.

ژیانی بە هەنگاوی ڕوون و جێگیر و، بە دانایی و، بە ویستێکی هۆشیارانە و، بە شێوەیەکی پلان بۆ داڕێژراو بەڕێوەدەچێت، متمانە و، شکۆمەندیی و، سەرڕاستیی و، ڕێزداریی گرنگترین سیفەتەکانیەتی، لەبەرئەوە خەڵکی پتەوی و خولیای خۆسەپاندن لەم کەسەدا دەبیننەوە، بەڵام بە بیروڕاکانیان کاریگەری لەسەر جێدەهێڵن و، تێبینی و سەرنجەکانیان بە هەند وەردەگرێت. لەپێناو

سـەرکەوتوویی لـە بـواری مـاددی و بەدەسـتهێنانی نـاو و ناوبانگـدا دەکۆشێت، هەمیشە بەدوای هاوبەشێکی پتەوی بەهێزدا دەگەڕێت تـا پەیوەندی لەگەڵدا ببەستێت.

توانای پێشبینیکردن و وێناکردنی ڕاز و نیازی شاراوەی خـەڵکی هەیـە و، کاروبارەکـانی ڕێکـدەخات و، کەسـێکی بەسـۆز و بەزەییـە، هەرچەندە هەوڵدەدات ئەم هەستانەی بشارێتەوە.

بەڕووکەش گوێ نادات بە هەست و سۆز و ڕۆمانسیەت، تا بڵێیت ئارەزووی خۆسەپاندن و جڵەوکردنی کەسانی دیکە دەکات، ترس زاڵە بەسەر پەیوەندیی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا.

ئـەو ژنانـەی کـە لـەم جـۆرە کەسـێتییەیان هەیـە، حـەزیان لـە کارکردن و پیشەگەرییە، لەبەرئەوە بایەخدانیان بـە لایـەنی سـۆزداری لاوازە، ئەمەش وادەکات پێویستبکات ئەم لایەنەیان یادبخرێتەوە.

## حەوتەم: کەسێتی بێ باکی خۆهەڵکێش

ڕووکەشـبینە، خولیـای سەرکەشـی دەکـات، گـوێ بـە بابەتـە جدیـەکان نـادات، ئـارەزووی پێکـەنین و گاڵتەوگـەپ و خۆشـکەیفی دەکات، سیفەتی جیاکەرەوەی ئەوەیە گەر دەسـت بـە کارێك بکـات نایگەیەنێتـە ئـەنجام، چـالاك و زینـدوو و گەشـبینە، تێدەکۆشـێت

خزمەتێك پێشكەشی جیهان یان خێزانەكەی یان هەر كەسێكی دیكە بكات.

لەبارێكدا گەر ئەم جۆرە كەسێتییە خوودی خۆی نەناسێت خاڵی لاوازی بریتیە لە: گاڵتەو گەپ و چێژلەژیان بینین.

بەڵام لەبارێكدا گەر خۆی بناسێت خاڵی بەهێزی بریتییە لە: قەناعەت.

ماڵ و سامان بە بنچینەی ژیان دەزانێت، لەبەرئەوە هەوڵدەدات پارەو سامان كەڵەكەبكات، بۆئەوەی لە چێژوخۆشی و خۆشڕابواردندا بەخەرجی بدات و، بە جوانیەكانی ژیان ئاشنابێت، بۆیە لە چاوی خەڵكییدا كەسێكی پێنەگەیشتووە. گەر خۆشگوزەرانی خۆی مسۆگەركرد دەبێتە كەسێكی تەمبەڵ و، هەموو خەمی تاقیكردنەوەی چێژ و خۆشییەكانی ژیان دەبێت.

توانای بەیەككەیاندنی بیروبۆچوونە جیاوازەكان و، دۆزینەوەی ڕێگەچارەی گونجاوی هەیە.

هەروەها توانای ڕێكخستنی خود و كاروفرمانەكانی ڕۆژانەی هەیە و، بە هەردوو سیفەتی سۆز و بەزەیی دەناسرێتەوە، هەرچەندە هەوڵیش دەدات بەئاشكرا دەریاننەبڕێت.

دڵنیایی و خەیاڵی ئاسوودە و دەوڵەمەندی و سۆزدارییش لە گرنگترین تایبەتمەندییەكانی ئەم جۆرە كەسێتییەن.

## هەشتەم: کەسێتی (سەرکردە)

ئارەزووی سەپاندنی بیروبۆچوون و کەسێتی خۆی دەکات و، پارێزگاری لە کەسانی دەوری دەکات و، بایەخیان پێدەدات، ئامادەیە لە پێناویاندا بکۆشێت، بەڵام لەم بارەیەوە هەندێك جار زیادەڕەوی دەکات، ڕێزی ئەو کەسە دەگرێت کە بە ڕوویدا دەوەستێتەوە و، بوێرانە بیروڕای جیاوازی خۆی لەبەرامبەریدا دەردەبڕێت. بە ڕاشکاویی و دامەزراوییەوە مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا دەکات و، خۆپارێزە و، متمانەی بە خۆی هەیە.

لەبارێکدا گەر ئەم جۆرە کەسێتییە خوودی خۆی نەناسێت خاڵی لاوازی بریتیە لە: خۆبەگەورەزانین و لوتبەرزی.



بەڵام لەبارێکدا گەر خۆی بناسێت خاڵی بەهێزی بریتییە لە: دڵ پاك و بێگەردیی تا ئاستی ساویلکەبوون.

بــەردەوام کــارکردن و تێکۆشــان دروشمــی ژیانیــەتی، تــا ماندوونەناســانە و کۆڵنەدەرانــە بگاتــە پلــە باڵاکــان، توانــای ئاوەژووکردنــەوە و گــۆڕینی شــێوازی ژیــانی خــۆی هەیــە، سەرپەرشتیکردن و بەڕێوەبردنی کۆڕ و کۆبوونەوەکان سیفەتێکی خۆڕسکیەتی. هەنــدێك جــار ئــارەزووی خۆشــگوزەرانیی بــەرەو ئەنجامــدانی ڕەفتــاری منداڵانــە پەلکێشــی دەکــات، ئەمــەش مایــەی کەیفخۆشیی ئەو کەسەیە کە هاوڕێیەتی دەکات، چاوەڕوانیی زۆری لە هاوبەشی ژیانی هەیە، لەهەمان کاتدا سۆز و خۆشەویستی و ئــەوینی خۆی پێشکەشدەکات.

وا هەست دەکات لە خاڵی لوتکەدایە و، توانای بینینــی هــەموو شــتێکی هەیــە و، جڵــەوی بەســەر هــەموو ئەوانــەدا دەشــکێت کــە لەدەوریدان و، دەتوانێت لە هەستەکانیان تێبگات.

داهێنانخوازە و، بایەخ بە کەسانی دیکە دەدات، گوێگرێکی بــاش و بەهۆشە بۆ کەسانی دیکە.

خــۆی زۆر لــە هەســت و ســۆز و ڕۆمانســیەت بــەدووردەگرێت، بەردەوام هەوڵدەدات خۆی لە پەیوەندییە سۆزدارییەکانەوە نەگلێنێت و، ژیانێکی سەربەخۆیانەی هەبێت.

## نۆیەم: کەسێتی (چاکساز)

تێڕوانینی دوو فاقانەی هەیە، چونکە هەندێ جار بیروڕاکانی خەڵکی بە بیروڕای خۆی دەزانێت، لەبەرئەوە بە ئاسانی بە بیروڕاکانیان قایل دەبێت و، لە ژیانیدا بەرجەستەی دەکات. کەسێکی بێ زیان و خۆپارێزە تا ئاستی سستی و خاوو خلیچکی، ناتوانێت بڕیار لەسەر پاشەڕۆژی خۆی بدات، ئەمەش وادەکات ببێتە نێچیری ئەو کەسانەی ئارەزووی خۆسەپاندن و زاڵبوون دەکەن، کەسێتییەکی دڵپاك و کۆمەڵایەتییە و، ئارەزووی هاوکاریکردنی کەسانی دیکە و، سازاندنی کەشێکی دۆستانە دەکات.

لەبارێکدا گەر ئەم جۆرە کەسێتییە خوودی خۆی نەناسێت خاڵی لاوازی بریتیە لە: تەمبەڵی

بەڵام لەبارێکدا گەر خۆی بناسێت خاڵی بەهێزی بریتییە لە: جموجۆڵ و کاروچالاکی.

هەڵسوکەوتەکانی دەرەنجامی هەستە هەڵچووەکانیەتی، ئەوەش وا دەکات خەڵکی گەمە بە هەستەکانی بکەن، پێویستی بە بوونی کەسێکی متمانەپێکراوە لەژیانیدا بۆئەوەی بتوانێت کار ڕاپەڕێنێت، مامەڵەکردن لەگەڵی ئاسانە، خۆشڕەفتارە و پەیوەندیەکانی لەگەڵ خەڵیدا دۆستانەیە، دەزانێت چۆن خەڵکی بە بیروبۆچوونەکانی خۆی

قایل دەکات، هەستەکانی بێگەرد و خۆشەویستیئامێزن، دەتوانێت بەجۆرێك هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی بەپێی هەستەکانی خۆی یا کەسانی دیکە بگۆڕێت، کە گونجاو بێت لەگەڵ ئەو خواستانەی لەوانی چاوەڕێ دەکات، ئەمەش مایەی لێ تێنەگەیشتنیەتی لەلایەن خەڵکیەوە.

**خولیاکانی و ئەو بوارانەی بایەخیان پێدەدات:**

بایەخ بە هەموو ئەو بابەتانە دەدات کە پەیوەندیان بە زانستی پلاندانان و بەڕێوەبردنەوە هەیە، چالاکە، گورجوگۆڵە و هەمیشە لە براوتدایە، دڵپاکە و، بە زمانی شیرین بیرۆکەیەکت تێدەگەیەنێت، لەکاتی مامەڵەکردن لەگەڵیدا شێوازی مامەڵەکردنەکەت زۆر گرنگە بۆ سەرکەوتنی پەیوەندیەکەتان.

تەنها باوەڕ بەوە دێنێت کە خۆی ئەزموونی کردووە و تاقیکردووەتەوە، بە ڕووخسارەکان و ڕووکەش فریودەخوات، خۆشەویستە لای خەڵکی، لەبەرئەوە خواستی بەستنی پەیوەندی سۆزداری ئاراستەدەکرێت، بەهۆی دڵپاکییەوە دووچاری چەندین گرفت دێت، بۆیە بەردەوام پێویستی بە وریایی و خۆپاراستنە..

خوێنەری بەڕێز، بۆ زیاتر ئاشنابوون بە هەر نۆ جۆرەکەی کەسێتی، ئەوا پێمان باشە کتێبی (الشخصیات المتعددة) و کتێبی (الطاقات الخمسة و تحولاتِها) بخوێنیتەوە.



# 4 چوار جۆرەکەی هاورێ لە دیدی (ئەبقراط)ەوە

پێکهێنەرەکانی مادده لە گەردووندا بەلایەنی کەمەوە چوار جۆرن، کە بریتین لە (خاك و ئاگر و ئاو و هەوا)، بەو پێیەی کە ئەمانە ڕەگەزەکانی مادەن و، جەستەی ئێمەش پێکدێنن، کەواتە ئێمەش بەسیفەت و تایبەتمەندی ئەو چوار پێکهێنەرە دەناسرێینەوە، خۆئەگەر تایبەتمەندی یەکێك لەم چوار پێکهێنەرە دیاریکراوە لەوانی دیکە زیاتر لە کەسێتیماندا ڕەنگ بداتەوە، ئەوا کەسێتییەکەمان بەناوی ئەو ڕەگەزەوە ناودەبرێت، وەك کەسێتی خاکی و، کەسێتی ئاگری و، کەسێتی هەوایی و، کەسێتی ئاوی.

## هاورێی ئاگرین:

لە چاوتروکانێکدا بیروبۆچوونەکان لای گەڵاڵەدەبن و، بە وزەکەیان چالاکی دەکەن و، هانی دەدەن بۆ بەخشین و لەخۆبووردوویی، بەڵام لەهەمان کاتدا ڕەنگە بە کاریگەری گوژمی ئەم وزەیە هەموو شتێك ڕامالێت کە بێتە ڕێی. خوازیارە هەموو شتێك بێ وەستان و دواکەوتن بەدەستبهێنێت، بەهرەی نوێبوونەوە و خۆبوژاندنەوە لە ناخیدا کارایە؛ چونکە هەمیشە لە ئامادەباشیدایە

بۆئەوەی سەرلەنوێ لە خاڵی سفرەوە دەستبەکاربێت بەرەو لوتکە، ئەم کەسێتییە نموونەی پریشکی داهێنان و، فێربوون و، چێژوەرگرتنە.

## هاوڕێی ئاوی:

کەسێکی ئاڵۆز و ناڕوون و بە ڕازونیازە، زۆر هەست ناسکە، هەستی ناوەکی بەهێزە و زوو لە ناخی کەسەکانی دیکە تێدەگات، تاوێك ئارەزوو دەکات پارێزگاری لێبکرێت و، تاوێکیش ئارەزوودەکات خۆی پارێزگاری لە کەسانی دیکە بکات، ئەم کەسێتییە نموونەی ڕاگۆڕکێ و، گۆڕانکارییە و، ئارەزووی ڕۆچوون دەکات لە بابەتە ڕۆحانییەکاندا.

## هاوڕێی هەوایی:

چێژ لە فێربوونی زانست و زانیاری و گەیاندنی بە کەسانی دیکە دەبینێت، خولیای فێربوون دەکات و، لەدژی ململانێ و ناکۆکییەکانە، بەردەوام لەتوانایدایە کارەکانی خۆی بەجۆرێك ڕێکبخات، کە بە مەبەست و ئامانجەکانی خۆی بگەیەنن، توانای بڕیاردان و کرانەوەی هەیە بەڕووی جیهاندا.

## هاوڕێی خاکی:

خاوەنی بیروهۆشێکی ساماڵە، بوارنادات خەیاڵات و ئەندێشە کەمەندکێشی بکەن، شورا و بەربەستی بەرز لەدەوری ناخی خۆی

بنیاتــدەنێت، بــەڵام تاڕادەیــەك كۆمەڵایەتییــە لەئاســت گفتوگــۆ و چــاوپێكەوتنە ئامانجــدار و بنیاتنەرەكانــدا، بــە پێــی توانــا ئــەركی كۆمەڵایــەتی خــۆی بەجێــدێنێت و، نموونــەی تێكۆشــانی بــەردەوام و، كۆششكردنە بەرەو نموونەیی بوون و كەماڵ.



## چەند جۆرێكی دیكەی هاوڕێ



### هاوڕێی هۆشمەند (عەقلانی):

سیفەتەكانی:



ئــەم كەســێتیە بایــەخ بــە بابەتــەكانی بیرمەنــــدیی و، لۆژیــــك و، ژمارەكـــان و، ژمێریاری و، هەموو ئەو شـتانە دەدات كـە پەیوەندیان بە گــەردوون و، گەلەئەسـتێرە و، خولگــەی ئەســتێرە و هەســارەكان و، سیســـــتمەكان و، زانیــــاری گشــــتی و، ڕۆشــنبیری و، زانســت و، كتێــب و، پێشــبڕكێ زانســتیەكانەوە هەیــە، ژیانی ئەم كەسە بە شێوەیەكی تونـدوتۆڵ بــە بــوارە زانسـتییەكانەوە گرێدراوە.

**چۆن دەیناسیتەوە:**

خێرایە لە قسەکردندا، ئارەزووی بیستنی وتەی بەنرخ دەکات، بایەخ بە نوێترین داهێنراوەکان دەدات.

**بۆ بەستنی پەیوەندی لەگەڵیدا:**

سەرنج بدە: کاتێک دەڵێت "من هەر بەم شێوەیە بیردەکەمەوە"، پەنجەی دەخاتە سەر سەری.

**رووکاری کەسێتیی:**

پێویستە لەرێگەی گفتوگۆ و قایلکردنەوە بیرۆکەیەکی بۆبخەیتەروو تا لێت تێبگات و، بتوانیت رەفتارەکانی بگۆڕیت، بەلام ئەم کارە زۆر بە وریاییەوە ئەنجام بدە، نەبا هەستی بریندار بکەیت، چونکە کەسێکی زۆر هەستیارە.

زۆرینەی کات کەسێکی گۆشەگیرە و، تەنها لەگەڵ کەسانی بیرمەنددا دەگونجێت.

## هاوڕێی بەسۆز:

**سیفەتەکانی:**

ئەم کەسێتییە بە هەستناسکیی دەناسرێتەوە و، بایەخ بە پەیوەندییەکانی هاوڕێیەتی و، کۆبوونەوە خولی و بەردەوامەکانیان دەدات.

**چۆن دەیناسیتەوە:**

قسەکانی سادە و ئاسایین و، شیوازی قسەکردنی کەمێك خاوە.

**ئەو بوارانەی بایەخیان پێدەدات:**



شیعر، ئەدەب، پێداویستییە دەروونییەکان.

**بۆ بەستنی پەیوەندی لەگەڵیدا:**

سەرنج بدە: کاتێك قسە دەکات دەستی دەخاتە سەر دڵی، یان ئاماژە بۆ دڵی یان بۆ خۆی دەکات.

**ڕووکاری کەسێتیی:**

پێویستە لە ڕێگەی دڵەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت، خۆشەویستی بۆ کەسێك یان شتێك، یان بابەتێك بیرکردنەوە و ڕەفتارەکانی دەگۆڕێت.

ئارەزوو دەکات خزمەت پێشکەشی کەسانی دیکە بکات و، دەستپێشخەرە، لە هەموو کەس زیاتر ڕێزی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەگرێت.

## هاوڕێی ئارەزووباز:

سیفەتەکانی:

هەمیشە لە خەیاڵی دابینکردنی پێداویستیە ماددی و دنیایەکانی و، بەرژەوەندییە جەستەییەکانیدایە، ئەمەش بەپەیرەوکردنی بنەمای بەرژەوەندی و قازانج، واتە چێژبینین و دوورخستنەوەی ئازار.



چۆن دەیناسیتەوە:

زۆر خاوە لە جموجوڵەکانیدا.

ئەو بوارانەی بایەخیان پێدەدات:

بایەخ بە مادە و پارە و سامان دەدات بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستییە جەستەییەکانی، بە بیرکردنەوە لە وەرزش و پارە و کارەکانییەوە سەرقاڵ دەبێت.

بۆ بەستنی پەیوەندی لەگەڵیدا:

سەرنج بدە: کاتێك قسە دەکات، جوڵەکانی بە ئاراستەی جەستە و روو لە زەوین.

کۆبوونەوە و بۆنە و یادە خۆشەکان خۆشحاڵی دەکەن، بەڵام بەرژەوەندییەکانی زاڵ دەکات بەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانیدا.

**ڕووکاری کەسێتیی:**

لەڕێگەی لایەنە ماددی و بەرجەستەییەکانەوە ڕەفتاری لەگەڵدا بکە و، پێی بڵێ: من بەرژەوەندی تۆم دەوێت، دەمەوێت سوودمەند بیت...

## هاوڕێی دیدەیی:

**سیفەتەکانی:**

زوو بڕیاردەدات، دیدێکی ستراتیجی هەیە، لەتوانایدایە لەکاتی کێشە و گرفتدا وەك بەڕێوەبەر کار بکات، ئاستێکی بەرچاوی کارلێککردنی هەیە لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا، دەتوانێت دەرەنجام و داهاتووی کارەکان بێنێتە پێش چاوی، لە تاقیکردنەوەی زارەکیدا بەشێوەیەکی باش ڕەفتار دەکات، لەگەڵ تاقیکردنەوە لەناکاوەکاندا بەباشیی ڕەفتار دەکات. لەتوانایدایە بە وێناکردن ئەو لایەنانەی کارێك ببینێت کە کەسانی دیکە ناتوانن ببینن، بەشێوە و ڕووکاری کەسەکان فریودەخوات و لەخشتەدەبرێت، دەترسێت شکست بێنێت و بەچۆکدابێت، بەهۆی زۆر هەستکردن بە ترسەوە بەردەوام لە دڵەڕاوکێ و گرفتداریدایە، پەلەکارە لە وەڵامدانەوەی خەڵکیدا، ئەو یاریانەی لا پەسەندە کە ڕەنگاوڕەنگ و گاڵتەئامێزن، ڕەنگە بە وشەیەك زیاتر یان کەمتر لە ئاستی گونجاو گوزارشت لە ناخی بکات،



ئارەزووی زاڵبوون و خۆسەپاندن دەکات، چونکە پێیوایە دەتوانێت شتەکان لە هەموو ئاڕاستەکانی لێڕوانینەوە ببینێت. هەڵەشەیە لە بڕیارداندا لەکاتێکدا بڕیارەکە پێویستی بە بیرکردنەوەی لەسەرخۆش بێت، ئەگەر پەرداخێك لەسەر قەراغی دیوارێك ببینێت ئارام ناگرێت و، وا خەیاڵ دەکات کەوتوەتەخوارەوە.

**چۆن دەیناسیتەوە:**

لێهاتووە لە هەر شتێکدا کە پێویستی بە بینین بێت، داهێنانخوازە و، ئەو لایانەنانە دەبینێت کە کەسانی تر نایبینن، دەتوانێت پێشبینی و وێنای دەرەنجامەکانی کارێك بکات، چارەسەری خێرا و جێگرەوەی جۆراوجۆری لا گەڵاڵەدەبێت.

**- لە ڕێگەی وشەکانیەوە:**

ئەمانە ئەو وشانەن کە زۆر بەکاریان دەهێنێت: "دەبینم، دیمەن، پرشنگ، سپێدەی بەیان، سێبەر، بریقەدانەوە، پاك و بێگەردی، جلوبەرگی بریقەدار، وای دەبینم، بۆچوون، تێڕوانین بۆ ئایندە، وێنەیەکی ناڕوون و شێوێنراو، نیگای توندوتیژ، فرە میزاج"..

- له ڕێگەی خەتی نووسینییەوە:

بە زۆری پیتی (س) وەك تیرێك بۆ خوارەوە دەنووسێت.

- لەگەڵیدا بدوێ:

شێوازی قسەکردنی خێرایە، ئەو وشەو دەستەواژە و ڕستانە بەکاریدێنێت کە پەیوەندییان بە بینین و وێنە و هاوشێوەکانییەوە هەیە. ئاوازی دەنگی بەرزە و پەشۆکانی پێوەدیارە، وەك ئەوە وایە کە ئاوازی پیتەکان لە لوتیەوە دەربچێت، پێویستە بابەتەکەی بەشێوەیەکی گشتی بۆ شیبکرێتەوە، پێش ئەوەی بچێتە نێو وردەکارییەکانەوە.

بۆ پێکهاتن لەگەڵیدا:

پێی دەڵێم: من ئێستە ئیتر تێڕوانینەکەت بە ئاشکرا و بەڕوونی دەبینم.

بۆ بەستنی پەیوەندی لەگەڵیدا:

سەرنج بدە: بەجوڵەی خێرا و بەشێوەیەکی هەڕەمەکی بە دەستەکانی ئاماژە بۆ شتەکان دەکات. لەکاتی قسەکردندا پشت بە جوڵەکانی جەستەی دەبەستێت.

ڕووکاری کەسێتیی:

پشـــوودرێژنییە، هـــەر ڕۆژەو جۆرێکـــە، بـــەخێرایی بیروڕاکـــانی دەگۆڕێـــت.. بـــەڵام دەکرێـــت لـــە گرفـــت و تەنگەژەکانـــدا بکرێتـــە بەڕێوەبەر.

## هاوڕێی بیستەکیی:

سیفەتەکانی:



پێـــی باشـــە کاغـــەز و قەڵـــەم بـــــەکاربێنێت لـــــە ڕێکخســـــتنی بیروبۆچوونەکانیدا.

خـــۆی لەگـــەڵ ئـــەو کارانـــە دەگونجێنێـــــت کـــــە دەیـــــەوێت ئەنجامیان بدات. ئـەو قسـانەی کە دەیبیســـتێت ئاڕاســـتەی ژێریـــی دەکـات، تـا بتوانێـت لـە وتـەکان تێبگات و، شیکاریان بکات. لەسەر بنەمای لێکۆڵینـەوەی پێشـوەخت بڕیاردەدات، بۆیە پاش ئەمە پەشیمان نییە لەوەی کە ئەنجامی داوە.

وشە پەیوەندیدارەکان بە ڕێکخستن و ڕێکوپێککردن و بابەتە ژێرییەکانەوە باڵیان بەسەر شێوازی قسەکردنیدا کێشاوە.

بــەردەوام هەوڵــدەدات پابەنــدبێت بــە وادە و بــەروار و کــاتی دیاریکراوی کارەکانی ژیانی. هانی خەڵکیش دەدات بۆ پــەیڕەوکردنی ئەم میکانیزمە.

تونــای گــۆڕینی کــارە نووســراو و تۆمارکراوەکــانی هەیــە بــۆ واقیعێکی بەرجەستەکراو، دانا و هۆشمەند و ڕێکخار و بیرمەندە، بۆیە شیاوە بۆ کاری ڕێکخستنی شــتومەك و بیرۆکــەکان. لەتوانایدایــە ئــەو دیمەنانە بکاتە واقیعێکی بەرجەستەکراو کە لە خەیاڵیــدا گەڵاڵــەدەبن. بە وتەی شیرین و مەرایی ئامێز لەخۆبایی دەبێت.

هەرچــەندە کەســێکی خــاوەن لۆژیکــە بــەڵام زۆر واقیعــی نییــە، چونکە بەهۆی زۆری ڕێکخســتن و ئەندازەگیرییــەوە دەبێتــە کەســێکی بیرۆکەداڕێژ و تیۆری.

توانای ڕوانینی دوور مەودای نییە بــۆ داهــاتوو. ئــەو یاریانــەی لا پەسەندە کە دەنگیان لێوەدێت. هەڵوێســت و کارەکــانی فەلســەفی و لــۆژیکی و نابەرجەســتەن. ئــارەزووی ژیربێــژیی و گفتوگــۆ و مشــتومڕ دەکــات. لــە کــات و بارودودۆخــە ســەخت و لەناکاوەکانــدا توانــای بڕیــاردانی نییــە. تاقیکردنــەوە زارەکییــەکان مایــەی گــرفتن بــۆی. ناتوانێت لە دۆخی گرفت و کێشەئامێزدا ڕەفتار بکات.

چۆن دەیناسیتەوە:

بیروبۆچوونەکانی ڕێکخراو و لۆژیکین، بایەخ بە کات دەدات، قسەکەرێکی لێهاتووە، چونکە جوڵەی دەستەکانی هەماهەنگە لەگەڵ جوڵەکانی جەستەیدا.

- لە ڕێگەی وشەکانیەوە:

بەگشتی لەکاتی ئاخاوتندا ئەم وشانە بەکاردەهێنێت: (دەنگ، ئاواز، نەرمی و زبری دەنگ، بێدەنگی، مشتومڕ، زۆربلێیی، گفتوگۆ، بەبایەخەوە گوێدەگرێت، هێز و کاریگەریی وشە، زەنگەکانی مەترسی، قسەی خەڵکی، دەنگێکی ڕوون، دەستەواژەکانی خۆشەویستی و ستایش، زۆر قسەکردن).

- لە ڕێگەی خەتی نووسینیەوە:

زۆربەی جار پیتی (س) بە سێ چوکڵە دەنووسێت.

- لەگەڵیدا بدوێ:

بە دەنگێکی ڕوون قسە دەکات، بە شێوەیەکی جوان و هاوسەنگ بەرز و نزمی لە ئاوازی دەنگیدا دەکات.

کەسێتی بیستەکی هەیە حەزی لە دەنگی زۆر بەرز و توندە، کەسێتی بیستەکیی هێوریش هەیە کە حەزی لە دەنگی نزمە.

بۆ پێکهاتن لەگەڵیدا:

پێی بڵێ: من هەستەکەم دەتوانم ئاوازی دڵفرێنی قسەکانت ببیستم.

بۆ بەستنی پەیوەندی لەگەڵیدا:

سەرنج بدە: بە چەند هەنگاوێکی هاوسەنگ جوڵە دەکات، دەستەکانی بە ئاڕاستەی گوێیەکانی و دەمی یان نزیك لە سینەی دەجوڵێنێت.

هاوشێوەبوون:

قسەکەرێکی لێهاتووە، دەتوانێت بەهۆی نەستی زیندوویەوە (اللاشعور) لە جوڵەی لێوی کەسی بەرامبەرەوە وشەکان بخوێنێتەوە و تێبگات. لە هەر کارێکدا کە پێویستی بە لۆژیك و زنجیرەبەندیی و پلاندانان هەبێت کارامەو لێهاتووە.

## هاوڕێی چالاك و بەهەست:

سیفەتەکانی:

ئارەزووناکات لە کۆبوونەوەکاندا ئامادەبێت، کار و بەرهەم دەخوازێت نەك وتە و تیۆری نووسراوی سەرکاغەز، توانای جێبەجێکردنی کاری هەیە، شێوازی ژیانی کردارییە، کارلێك لەگەڵ ڕووداوەکاندا دەکات و چەقبەستوو نییە، پلان و بیرۆکەکان دەگۆڕێت

بۆ واقیعێکی کرداری و بەرجەستەکراو، دوورە لە خەون و خەیاڵ و قسەی ڕەنگاوڕەنگ و فەلسەفەبازی، دەکرێت لەهەمان کاتدا چەند سروشتێکی لێ بەدی بکرێت وەك: (دڵڕەقی و نەرمونیانیی — خۆشەویستی و کینە).

خاوە لە بڕیارداندا، بەڵام ئەگەر بە بابەتێك کاریگەربێت ئەوا زوو بڕیاری لەبارەوە دەدات، پشت بە لۆژیك نابەستێت، چونکە لەسەر بنەمای هەستەکانی هەنگاودەنێت، تێڕوانینی کورت مەودایە و، بۆ گەیشتن بە ئامانجە نزیکەکان تێدەکۆشێت، هیچ گرفتێکی نییە گەر هەموو ڕۆژێکیش خۆی بە بەربەست و دیوارێکدا بکێشێت.



چۆن دەیناسیتەوە:

وردەکارە، وەفادارە، جێی متمانەیە، توانای بەرگەگرتنی سەختی هەیە، زۆر خۆشەویستی خۆی بۆ کەسانی دەوروبەری دەردەبڕێت.

- لەڕێگەی وشەکانیەوە:

بەگشتی لەکاتی ئاخاوتندا ئەم وشانە بەکاردەهێنێت: (هەست، سۆز، دەستی لێدا، جڵەوی خۆی دەکات، تورەیی تاوی سەندووە،

بناغەیەکی تۆکمە، کەرامەتی برینـدار دەکـات، سروشـتێکی سـارد و گوێپێنەدەر، بەتوندی دەستی پێوە گرت، زبر، ناسك، ڕەق، نەرم).

- لەگەڵیدا بدوێ:

ئاوازی دەنگی نزمە، ئارەزووی هێمنی دەکات، بایەخ بە زمـانی سۆزئامێز و دڵفڕێن دەدات.

- لەڕێگەی خەتی نووسینیەوە:

زۆرجار پیتی (س) بەڕێکی دەنووسێت، بەبێ چوکڵەکان و، دوور لە شێوە تیری، گەر پیتی (سین)ەکەی زۆر درێژکردەوە ئەوا زیـاد لـە پێویست هەستیارە.

**بۆ پێکهاتن لەگەڵیدا:**

پێی بڵێ: بەڕاستی کاریگەریت لەسەر ژیانم هەبووە و، پـەیڕەوی قسەکانتم کردووە.

**بۆ بەستنی پەیوەندی لەگەڵیدا:**

سەرنج بدە: بە کەمجوڵەیی دەناسرێتەوە، بەگشتی زۆربەی کات دەستێکی دەخاتە گیرفانیەوە و، دەستەکەی تری دەجوڵێنێت.

**هاوشێوەبوون:**

بەشێوازێکی هێمن و لەسەرخۆ دەدوێت، وشەکانی لە ناخیەوە هەڵدەقوڵێن، وتەگەلێکی میهرەبانانە و گەرموگوڕن و، ڕاستگۆیی و هەستبەرزییان تێدا هەستپێدەکرێت، کە یادی ڕابردوو دەکات، یا باسی لێوەدەکات لەخەیاڵدا نوقم دەبێت.

بۆ ڕاپەڕاندنی کار شیاوە و، نەخشە و پلانە تیۆرییەکان دەگۆڕێت بۆ واقعێکی زیندوو.

## هاوڕێی کەللەڕەق

**(تەنها گوێڕایەڵیی هەستی ناوەکی خۆی دەکات):**

**سیفەتەکانی:**

هەمیشە ئارەزوودەکات پێداویستییە تایبەتەکانی خۆی دەستەبەربکات، چونکە زۆر بەدەگمەن دەیبینین لا بەلای هاوڕێیەکیدا بکاتەوە و هەواڵی بپرسێت، لەبەرئەوە هەندێکجار خەڵکی وەك کەسێکی خۆویست و گۆشەگیر لێیدەڕوانن.

زۆرتر پابەندی جیهانی ناوەکیی خۆیەتی، لەبەرئەوە زۆرجار هاوڕێکانی پێی دەڵێن کەسێکی لەخۆباییە.

جـۆری پـەیوەندییـەکانی لەگـەڵ کەسـانی تـردا لەسـەر بنـەمای هەسـتەکانی هەڵدەسـەنگێنێت نـەك لەسـەر بنـەمای ئـەنجامی کارەکەکان.



هەندێك جار لـە ڕوانگـەی بەرژەوەندییـە کەسییەکانییەوە لە دنیا دەڕوانێت، بەڵام بێ ئەوەی بکەوێتە داوی خۆپەرستییەوە.

- چۆن دەیناسیتەوە:

سەری بەهەماهەنگیی لەگەڵ دەربـڕین و گوزارشتەکانی ڕووخساریدا ناجوڵێنێت.

سەرنج و بایەخ بە نـاوەڕۆك دەدات نـەك ئاماژە زارەکییەکان.

ئەگـەر لـەناکاو قەڵەمەکـەت لەدەسـت کەوتـەخوارەوە بـۆت هەڵناگرێتەوە، ئەگەر هەستی کرد پێویستت بەشتێك هەیە ڕاستەوخۆ دەسپێشخەری ناکات تا یارمەتیت بدات.

## چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت:

بـە ئامـاژەبۆکردن یـا گاڵتـەپێکردن کاردانـەوەی نابێـت، بـەڵکو پێویستە شێوازی ڕاستەوخۆ و ڕاشکاوانە لەگەڵیدا پەیڕەوبکەیت.

گەر ویستت لەگەڵیدا بدوێیت، ئەوا بەم دەستەواژەیە دەست پێبکە: تۆ پێت چۆنە...؟

## هاوڕێیەك کە کەسانی دەوروبەری دەکاتە تەوەری ژیانی:

### سیفەتەکانی:

سەرنجی ئەو کارتێکەرانە دەدات کە کار لە خەڵکی دەکەن. لە ژیانیدا بە پلەی یەکەم بایەخ بە کەسانی دەوری دەدات و، هەر ئەوان تەوەری بایەخپێدانین، تەنانەت بەها باڵاکانیش هەر پەیوەستن بە خەڵکیەوە لای.

جۆری پەیوەندییەکانی بەخەڵکیەوە بەپێی کاردانەوەکانیان هەڵدەسەنگێنێت، ئارەزووی تێگەشتن و ڕوونکردنەوەی چەمکەکانی کەسانی دیکە دەکات.

### چۆن دەیناسیتەوە:

زۆر بەخێرایی بە ئاراستەی ئەو شتەدا ئاوڕدەداتەوە کە لە دەستی کەسێك دەکەوێتەخوارەوە، ڕێژەیەکی زۆر ئاماژەی جەستەیی و دەربڕینی ڕووخساریی هەیە.

تێبینی:

دەگونجێت کەسێك هەبێت کە وزە و توانای تایبەتی ناوەکی هەبێت و، کەسانی دیکە بکاتە تەوەری ژیانی خۆی.

**بۆ بەستنی پەیوەندی لەگەڵیدا:**

تۆ دەستپێشخەربە بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵیدا.

## هاوڕێی خۆنزیککەرەوە لە ئامانجەکان:

**سیفەتەکانی:**

ئامانجەکانی ڕوونن و، هەمیشە لەپێش چاوی خۆی ڕیزیان دەکات و، وەبیرخۆییان دێنێتەوە، بۆئەوەی وزە و توانای پێببەخشن بۆ هێنانەدییان.



لە ڕێگەی ڕێکخستنی کارەکانی بەپێی پلەبەندی و گرنگ و گرنگتر هەنگاودەنێت. زۆر خۆپارێزی ناکات و، دەرەنجامی خراپ لە خەیاڵیدا وێناناکات: (دەڵێت: بڕۆ و گوێی مەدەرێ).

زۆرجار هەڵەکانی دووبارە دەکاتەوە، سەبارەت بەو شتانە دەدوێت کە ئارەزوویان دەکات، نەك ئەوانەی کە ئارەزوویان ناکات، هەموو شتێکی نامۆ و جیاواز تاقیدەکاتەوە، ئەگەرچی زیانیشی پێ بگەیەنن.

### چۆن دەیناسیتەوە:

لە زاراوەدا دەوڵەمەندە. لە پەیداکردنی بژێویی و کارڕاپەڕاندن و گرفتەکانیان دەدوێت و، قسە لەبارەی ئەو کەس و بارودۆخ و لایەنانەوە دەکات کە پەیوەندییان بە بە پرۆژەکەیەوە هەیە.

تا ڕادەیەك سەری بەرەو پێشەوە ڕادەگرێ، چونکە ئامانجەکانی لەبەردەمیەوەن. کاتێك بە بیرۆکەیەك قایل دەبێت بۆلای ڕاست و بۆ سەرەوە دەڕوانێت.

### - چۆن مامەڵەی لەگەڵ دەکەیت:

وشە پەیوەستەکان و هاوبەندەکان بەکاربێنە لە وێنەی (پزیشك و نەخۆش – منداڵ و پەروەردە).

زۆر بایەخ بە گرفتە پێشبینیکراوەکان نادات، لەبەرئەوە زۆر لەبارەی مەترسییەکانەوە بۆی مەدوێ. تا دەتوانیت بایەخ بە خواست و ویست و ئامانجەکانی بدە.

## هاوڕێی خۆبەدوورگر (خۆپارێز):

دروشمی لەژیاندا بریتییە لە: (دەست بە کڵاوی خۆتـەوە بگـرە، تا با نەیبات).



سیفەتەکانی:

تێبینی ئەو شتە دەکات کە پێویسـتە خـۆی لێ لابـدات و، هەمیشـە خـۆی لـەو شـتانە دەپارێزێت کە ئارەزوویان ناکات.

لەتوانایدایـە بـە وریاییـەوە ڕووبەڕووی گرفتە هەنووکەییـەکان و ئەو گرفتانـەش ببێتـەوە کـە دەکرێـت لـە داهـاتوودا بێنـەڕێی، ئـەم کەسـێتیە هەڵـە و پێشـهاتە ئاگادارکـەرەوەکان لـە لایەنـە ئـەرێنی (ئیجابییەکان)ەوە زیاتر دەبینێت.

گرفتی هەیە لە ڕێکخستنی کار و فرمانەکانیـدا بـەپێی گرنگیـی و پلەبەندییان، چونکە یەکەمین و گرنگترین شـت لای ئـەم سـەلامەتی و هەڵهاتنە لە مەترسییەکان و، مەترسـیدار و مەترسـیدارترین دەبینێت نەك گرنگ و گرنگترین.

دیاریکردنی ئامانج بەکارێکی دژوار دەزانێت. قسە لەبارەی ئەو شتانەوە دەکات کە ئارەزوویان ناکات، نەك ئەوانەی کە ئارەزوویان دەکات.

سەبارەت بەو حاڵەتانە قسە دەکات کە پێویستە خۆییان لێ بپارێزێت و، ئەو کەسانەی کە پێویستە خۆییان لێ لابدات.

هەوڵی پەیداکردنی ئەزمون نادات (دەڵێت: ئاگاداربە و پەلەمەکە).

## چۆن دەیناسیتەوە:

قسەکردن لەبارەی ئەو کەس و بارودۆخ و لایەنانەی پەیوەندییان بە بە پرۆژەکەیەوە هەیە. تا ڕادەیەك سەری بەرەو پشتەوە ڕادەگرێ.

## چۆن مامەڵەی لەگەڵ دەکەیت:

بەدووی ئەو شتانەدا بگەڕێ کە پێویستە لێی دووربکەوێتەوە و، لێی دوپاتبکەوە کە توانای یارمەتیدانیت هەیە، گرفتەکانی بۆ شیبکەوە و، چارەسەری گونجاویشیان بۆ پەیدا بکە و پێشکەشی بکە.

یارمەتی بدە لە شارەزابوون لە کارێکدا (واتە بەو کارە دەستپێبکە لەگەڵیدا کە ئارەزووی ناکات، پاشان لە کۆتاییدا

یارمەتیی بدە لە شارەزابوون لەو کارەدا کە خوازیارە فێری بێت).
بۆی ڕوون بکەوە کە چۆن پلانەکەی تۆ ژیانی بۆ ئاسانتر دەکات.

## هاوڕێی خۆلێکچوێنەر:

توانایەکی زۆر بەرچاوی هەیە لە خۆگونجاندندا، بەڵام کێشەکەی لە سنوورداربوونی توانایدایە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری، هەروەها لە سروشتی گشتاندنی تێڕوانینێك یا دیدێکی دیاریکراو بەسەر هەموو کەس و بابەتێکدا. زیاتر ئارەزووی ڕوانین لە شتێکی بەرجەستە دەکات، نەك خەیاڵیی و مەعنەوی.



هەوڵدەدات خاڵی هاوبەش لەنێوان ئەوەی دەیبیستێت و ئەوەی دەیزانێت بدۆزێتەوە.. لای ئاساییە هەموو ڕۆژێك هەمان ژەمە خۆراك بخوات و هەمان جلوبەرگ بپۆشێت.

**چۆن دەیناسیتەوە:**

لەو وشانەی لەکاتی ئاخاوتندا بەکاریان دەهێنێت: (وەك، هەمان، لەو دەچێت، بەگشتی، دەیپارێزێت، دەمێنێتەوە، تۆ لە فلانەکەس دەچیت، ئەم وانەیە وەك..، ئەم قسانە وەك..). لە

ئەنجامدا ئەم لێکچوواندنانەش دەبنە مایەی داخراوی و گۆشەگیریی و، زووبڕیاردان لەسەر هەموو بابەت و کەسێك، لە ڕاستیدا ئەم جۆرە کەسێتییە لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نموونەی زۆرە.

## چۆن پێکبێیت لە گەڵیدا:

دۆزینەوەی خاڵی هاوبەش و سەرنجدان لە بابەت و کەسی لێکچوو، ڕەچاوکردنی چەقبەستوویی و جێگیریی و، خۆپارێزیی و، گۆڕانکاری نەکردن.



## هاوڕێی خۆجیاکەرەوە:

### سیفەتەکانی:

توانای خۆگونجاندنی نییە، کەسانی دەوروبەر لەخۆی جیاوازدەبینێت، بۆیە ناتوانێت بە ئاسانی لەگەڵیاندا پێکبێت.

زوو لە شتەکان بێزار دەبێت، لە پەیوەندییەکانیدا زۆر تێکەڵی کەسانی دیکە نابێت و، کەسێکی گۆشەگیرە. کەسانی دەوریشی نازانن چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، یا بەئەستەم دەتوانن لەگەڵیدا پێکبێن.

### چۆن دەیناسیتەوە:

لەو زاراوانەی لە کاتی ئاخاوتندا بەکاریان دەهێنێت: (نوێ، جیاوازی، هەڵگەڕانەوە، دانسقە و دەگمەن، شۆڕش، دەگۆڕێت، هەست بە گۆڕانکاریی دەکەم، من مرۆڤێکی نوێخوازم).

### چۆن لەگەڵیدا پێکبێیت:

بایەخدان بە داهێنان و نوێخوازیی و، دیتنەوەی چارەسەری نوێ. بەکارهێنانی زاراوەی وەك: شتە جیاوازەکان، شتی جیاواز هەیە.

## هاوڕێی تێکڕابین:

### سیفەتەکانی:



دەتوانێت بیرۆکەی سەرەکی و گشتی وانەیەك یا بابەتێك وێنابکات. بە بیرۆکە و چەمکە گشتییەکانی وانە یا بابەتەکان بڕوادێنێت و قایل دەبێت.

گەر وانەیەك بخوێنێت، ئەوا پێویستە لە سەراپای وانەکە تێبگات، تا پێگەی خۆی یا هەڵوێستی خۆی لەبارەیەوە دیاریبکات.

بایەخ بە ڕووکار و ئامانجی سەرەکی ئاڕاستەی وانەکە دەدات، بێئەوەی لە وردەکاری و نموونەکاندا قاڵبێتەوە. شێوازی بیرکردنەوە و کارکردنی هەنگاوبەهەنگاوی لا دژوارە. بە باسکردنی درێژدادڕ بێزاردەبێت.

لەدانیشتن لەسەر دواکورسی پۆلدا چێژدەبینێت، باشترین کەسە بۆ پلاندانان.

### چۆن دەیناسیتەوە:

لەو زاراوانەی کە لەکاتی ئاخاوتنندا زۆر بەکاریاندێنێت: (پوختەی باسەکە چیە، بەکورتی بۆم باسکە، بەگشتی، لە بنەڕەتدا، بەکورتی، تێگەیشتم، چوارچێوە، بیرۆکە، سەرەداوەکانم بۆ باسکە).

زۆر سەری دەجوڵێنێت، شانەکانی بۆ دواوە ڕادەگرێت، تا چوارچێوەی وێنە گەورە و سەرەکییەکە بەتەواویی ببینێت.

## هاوڕێی زۆر وردەکار:

### سیفەتەکانی:

کارەکەی بەش دەکات بۆ چەند هەنگاوێك. زۆر بە سەرنجەوە بایەخ بە وردەکارییەکان دەدات.

پێویستی بە تێگەیشتنە لە تەواوی وردەکارییەکانی بابەتێك، تا لەبارەیەوە بڕیار بدات.

ڕەنگە ئامانجی سەرەکی لەدەستبدات و لەیادی بکات، بەهۆی سەرقاڵبوونی بە وردەکاریەکانیەوە.

پێویستە قسەکەر نموونەی ڕوون و ئاشکراو دیاریکراوی بۆ باسبکات، تا ئەم تێبگات.

ئەگەر قسەی پێ ببڕیت، ئەوا سەرلەنوێ بابەتەکە لەسەرەتاوە باسدەکاتەوە.

### چۆن دەیناسیتەوە:

ئەم وشانە زۆر بەکاردێنێت: (وردەکاری و هەنگاوەکان، زاراوەکانی وەسف و وێناکردنی شێوازەکان، پڕاوپڕ، ڕێك وایە، بەوردی، سەرەتا، یەکەم، دووەم، خشتە، ڕێکوپێك، پێکهاتەکان، بەش، ئامارە).

جەستەی هەندێك بەرەو پێشەوە چەماوەتەوە.

### چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت:

باسی تەواوی وردەکاریەکانی بابەتەکەی بۆ بکە، دووربکەوەرەوە لە ئەگەرەکان.

چاوەڕوانی ئەوە مەکە کە چوارچێوە و وێنەی سەرەکی بابەتێك لە خەیاڵیدا وێنابکات.

## هاوڕێی ناچار:



دروشمی لە ژیاندا:

"کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەی، لەکاتێکدا دەتوانیت دوای بخەیت بۆ دووسبەی"!.

سیفەتەکانی:

تەنها لەکاتی پێداویستی و فشارلێکردن و بەرپرسیارکردندا کاردەکات.

هەرچی دەستبکەوێت و ڕووبدات پێی قایل دەبێت، ئارەزووی ئەنجامدانی ئەو کارانە دەکات کە ئاشکرا و مسۆگەرە و، دەترسێت لە ئەنجامدانی ئەو کارەی پێشتر تاقینەکردووەتەوە.

ئارەزوو ناکات لەو بابەتانەوە تێوەبگلێت کە پێشتر بە باشی پلانی بۆ دانەڕشتوون.

### پشێوی دەنێتەوە و بە هەڕەمەکی کاردەکات:

تەنها لە ژێر فشاردا کاردەکات.

ڕۆژێك پێش تاقیکردنەوە سەعی دەکات و وانە دەخوێنێت.

هەمیشـە دەسـتەواژەی (کـاتم زۆرە دواتـر سـەعی دەکـەم)ی کردووەتە دروشم.

چۆن دەیناسیتەوە:

ئەو وشانەی کە لەکاتی ئاخاوتندا زۆر بەکاریان دەهێنێت: (پێـی خۆشە، پێویستی پێیەتی، زۆر پێویستە، دەبێت وابێت، ئەوەو ئەوەم بەسەرداهات، چونکە هیچ چـارێکی تـرم نـەبوو، ئـەو ڕۆژە ناچـاربووم ئەوە و ئەوە بکەم، ئاخر هیچ ڕێگەچارەیەکی ترم نەبوو!).

چۆن مامەڵەی لەگەڵ دەکەیت:

هانگاوەکـانی کـارکردنی بـۆ دەستنیشـان بکـە و، دڵنیـا بـە لـە تێگەیشتنی لێیان، ئـەم دەسـتەواژانە دوپـات بکـەوە: (هـەنگاوەکان، چەسپاوە، ڕێگەی ڕاست، ئاڕاستەی دروست، کاری گونجاو).

## هاوڕێی لەسەرخۆ و هۆشمەند:

دروشمی لەژیاندا:

"کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەی".

سیفەتەکانی:

هەر کاتێـک بـواری هەڵبـژاردنی بـۆ بڕەخسـێت، هەوڵـدەدات ئـەو کارانە هەڵبژێرێت کە خۆی بایەخیان پێدەدات.

دەكۆشێت تا ڕێ و شێوازی نوێ و جێگرەوە بدۆزێتەوە بۆ برەوپێدان و نوێكاری لە كاردا. زۆر لەبارەی فراوانكردنی بوار و مەودای هەل و دەرفەتەكان دەدوێت. پەیڕەوكردنی تەنها ڕێگایەكی دیاریكراوی كاركردنی پێ باش نییە و، ڕقی لە ڕۆتینە.

هەمیشە چارەسەری جێگرەوە دەخاتە ڕوو.

كەسێكی ڕێكخار و خاوەن نەخشەی كاركردنە.

لەكاتی خۆیدا ئامادەباشیی بۆ ئەركەكانی دەكات، تەنانەت هەندێ جار پێش كاتی دیاریكراویش.

هەمیشە دەڵێت: "مادام دەتوانم، كەواتە هەر كاردەكەم".

ڕۆژانە وانەكانی دەخوێنێت و، فەرامۆشیان ناكات.

## چۆن دەیناسیتەوە:

ئەم وشانە زۆر بەكاردێنێت: (هەڵدەبژێرێت، هیوادارە، دەكرێت، دەتوانێت، بێگومان دەیكەم، دەگەم بە..، تواناكان، هەڵبژاردنەكان، پلان و ڕێگەچارەی جێگرەوە، شێوازی نوێ).

## چۆن مامەڵەی لەگەڵ دەكەیت:

هەموو هەڵبژاردەكانی بۆ ڕوون بكەوە، دڵنیای بكەوە كە بەئەنجامدانی فلانە كار هەڵبژاردەی زیاتری بۆ دەڕەخسێت.

## سوودێك:

دۆزینەوە و پەیداكردنی هاوڕێی باش كارێكی دڵخۆشكەرە، بەڵام لەوە خۆشتر ئەوەیە كە ناخی هەموو هاوڕێكانمان تەی بكەین و، وەك چۆن گەوهەر و ئەڵماس و زێڕ لە كانگای زەویدا دەدۆزینەوە، هەر وەهاش پەی بە نهێنییەكانی كەسێتییان ببەین، هەركاتێك بەتەواوی لە ناخی هاوڕێكەت تێگەیشتیت، ئەوا تەنها ئەوكاتە هەست دەكەیت پشكێك لە بەهەشتی سەر زەویت دەستكەوتووە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ﴾

الزخرف:٦٧ واتە: (دۆست و برادەران لەو ڕۆژەدا هەندێكیان دوژمنی هەندێكیانن چونكە تێئەگەن كە ئەوان بوون بەهۆی گومڕاە بوونیان، تەنها دۆست و برادەرانی وا نەبێ لە دنیادا لەخواترس بووبن ئەوانە هەر لەسەر دۆستایەتیی خۆیان ئەمێننەوە.) بەم شێوەیە دەتوانیت ڕایەڵەكانی خۆشەویستی لەنێوان خۆت و هاوڕێكانتدا بەهێزبكەیت و، دەتوانیت زیاتر لە هەڵسوكەوتەكانی هەریەكەیان تێبگەیت و، گەر هەركامیان ڕەفتارێكی نامۆیان لێوەشایەوە، ئەوا لێیان ناگریت و پاساویان بۆ دەهێنیتەوە و، تێدەگەیت كە هیچ یەكێك لە ئێمەی مرۆڤ بێ هەڵە و كەموكورتی نییە.

## لە قەفەسی تۆمەتبارکردندا:

# ناپاکیی هاورێیان..

گەر ڕۆژێك لە ڕۆژان هاورێیـەکت ناپـاکی بەرامبـەر کردیـت، ئـەوا باشتر وایە بە سینەفراوانییەوە هەڵوێست لە ئاستیدا بنوێنیت و، هـیچ پێویسـت ناکـات ببیتـە دوژمنـی، بـەڵکو لێـی ببـورە و، لەبەرامبـەردا پشوودرێژبە.

تەنانەت گەر توانای تۆڵەسەندنەوەشت هەبێت، خۆدەتوانیـت لـە کاردانەوەتـدا چاوپۆشـیکار و لێبوردەبیـت، خـوای گـەورەش ئـەم واتایەی لـە قورئانـدا دووپـات کردۆتـەوە، کاتێـك دەفـەرموێت: ﴿وَأَن تَعْفُواْ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى﴾ البقرة:٢٣٧، واتە: (بێگومـان چاوپۆشـی لەلایـەن مێردەکانەوەو دانی هەموو مارەییەکە بە ژنە تەڵاق دراوەکە نـزیکترە لە ترس لە خوداوە).

بـەڵام ئایـا دەتـەوێت یاسـای دڕنـدەی دارسـتان لەبەرامبەریـدا پەیڕەوبکەیت؟! واتە هەرکەسێك زیـانێکی پێگەیانـدیت، ئـەوا تـۆش بەهەمان شێوە زیانی پێبگەیەنەوە.



## چیرۆکێک

ڕۆژێك دوو هاوڕێ بۆ گەشت و سەیران چوونە دارستانێکەوە و، لەکاتی بەڕێ ڕۆیشتنیاندا لەبارەی هەندێ بابەتی گرنگەوە قسەیان دەکرد.

لەو کاتەدا دەنگێکی ترسناکیان گوێ لێ بوو کە لە دوایانەوە بەرزبوویەوە، کاتێك ئاوڕیان دایەوە، بینیان ورچێکی گەورە و ترسناك بەخێرایی بەرەو ڕوویان دێت. ئەمانیش لەو دیمەنە تۆقین و هەڵاتن.

بە هەموو هێز و توانایانەوە ڕایان دەکرد، بەڵام وادیاربوو نەتوانن لە چنگی ورچەکە ڕزگارییان بێت و، یەکێکیان ئاوڕی دایەوە بەلای ورچەکەدا، تا بزانێت چەندێك لە ورچەکەوە دوورن و، لەو کاتەدا بیرۆکەیەك بە خەیاڵیدا هات!

هەربۆیە وەستا و، جانتاکەی شانی دانا، تا پێڵاوە وەرزشیەکانی دەربهێنێت، بەڵام هاوڕێکەی بە سەرسوڕمانەوە پێی وت: (خۆ بە پێڵاوە وەرزشیەکانیشتەوە لەو ورچە دڕندەیە خێراتر نابیت).

بەڵام ئەو پێڵاوەکانی لەپێ کرد و، وتی: (پێویست ناکات لە



ورچەکە خێراتر بم، چونکە ئەوەندە بەسە کە لە تۆ خێراتر بم).

زۆر بەخێرایی دەستی بە ڕاکردن کردەوە، هەرچەندە هاوڕێکەشی بەتەواوی توانایەوە ڕای کرد بەدوایدا، بەڵام نەیتوانی بەم بگاتەوە!

بەڕاستی ئەو هاوڕێیەی کە خۆی ڕزگارکرد و، هاوڕێکەی لەپاش خۆیەوە جێهێشت، تا ورچەکە سەرقاڵبکات و، خۆی دەرفەتی ڕزگاربوون بقۆزێتەوە، نموونەی هاوڕێی ناپاکە.

گەر بۆت دەرکەوت کە هاوڕێکەت بۆتە کەسێکی ناپاك یان دوژمنت، ئەوا خەمبار مەبە، بەڵکو دڵخۆشبە کە سروشتی ڕاستەقینەیت بۆ دەرکەوتووە و، چیتر هاودەمیی ناکەیت.

**لەبەرئەوە بەردەوام لەیادت بێت:**

(گەر هاوڕێکەت هەڵەیەکی لەبەرامبەردا کردیت، ئەوا لێی ببورە، بەڵام لەیادی مەکە، نەبا ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە دوژمنت، هەندێك جاریش چاوپۆشی لە هەڵەی دوژمنەکەت بکە، نەبا ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە هاوڕێت).

# پێڕست


پێشەکی .................................................. ٢

هاوڕێیەتی لە زمانەوانیدا .................................. ٨

چەمکی هاوڕێیەتی .......................................... ١٠

لە ڕووکارەکانی هاوڕێیەتی .................................. ١٢

هاوڕێیەتی لەڕوانگەی تێگەیشتنی ئیسلامیەوە ................... ١٣

کاتێك هاوڕێیەتی دەگۆڕێت بۆ خۆشەویستی لەپێناوی خوادا ........... ١٧

من هاوڕێم نییە ............................................ ١٩

مەحاڵە هاوڕێیەکی ئەمەکدار لەم سەردەمەدا دەستبکەوێت ! ........... ٢٠

جۆرەکانی هاوڕێیەتی ........................................ ٢٢

هاوڕێیەتی لەگەڵ (خود)دا ................................... ٢٢

هاوڕێیەتی دایکان و باوکان لەگەڵ ڕۆڵەکانیاندا .................. ٢٧

هاوڕێیەتی لە نێوان خوشك و براکاندا ........................... ٢٨

هاوڕێیەتی لە قوتابخانە ...................................... ٢٩

پلەکانی هاوڕێیەتی .......................................... ٣٠

هاوڕێیەتی بەرژەوەندی خوازی .................................. ٣١

هاوڕێیەتی لەنێوان دوو ڕەگەزدا ................................ ٣١

هاوڕێیەتی لەنێوان (ژن و مێرد)دا ............................... ٣٤

هاوڕێیانی ئینتەرنێت .......................................... ٣٦

هاوڕێیەتی لەگەڵ شتانی تری جگە لە مرۆڤ ....................... ٣٨

– هاوڕێیەتی لەگەڵ ڕووەکدا .................................. ٣٩

– هاورێیەتی لەگەڵ شتە بێگیانەکاندا ........................ ٤٠
– هاورێیەتی و بەئەمەکبوون لەئاست ئاژەڵاندا.................. ٤١
ئایا هاورێیەتی پاش دەمەقاڵە و پیاهەڵشاخان دێتەکایەوە؟.......... ٤٤
کۆتایی هێنان بە ناکۆکی نێوان هاورێیان ........................ ٤٦
پارێزگاریکردن لە پەیوەندی هاورێیەتی ........................ ٤٧
قەرزکردن لەنێوان هاورێیاندا.................................. ٤٨
هاورێم پێویستە.............................................. ٤٩
سیفەتەکانی هاورێ............................................ ٤٩
هاورێی خراپ................................................ ٥١
بەباشی هاورێکانت هەڵبژێرە .................................. ٥٤
پلەبەندی بۆ هاورێکانت بکە.................................... ٦٤
هاورێکانت بدۆزەوە........................................... ٦٨
نۆ جۆرەکەی هاورێ ........................................... ٧٦
یەکەم: کەسێتی (نموونەیی)..................................... ٧٧
دووەم: کەسێتی (دڵپاك) ....................................... ٨١
سێیەم: کەسێتی (چالاك) ...................................... ٨٣
چوارەم: کەسێتی (رۆمانسی) .................................. ٨٥
پێنجەم: کەسێتی (چاودێر) .................................... ٨٧
شەشەم: کەسێتی (دڵسۆز)...................................... ٨٩
حەوتەم: کەسێتی بێ باکی خۆهەڵکێش............................ ٩٠
هەشتەم: کەسێتی (سەرکردە) .................................. ٩٢

نۆیەم: کەسێتی (چاکسان) ........................ ٩٤
چوار جۆرەکەی هاوڕێ لە دیدی (ئەبقراط)ەوە ................ ٩٦
هاوڕێی ئاگرین ............................ ٩٦
هاوڕێی ئاوی ............................ ٩٧
هاوڕێی هەوایی ............................ ٩٧
هاوڕێی خاکی ............................ ٩٧
چەند جۆرێکی دیکەی هاوڕێ ........................ ٩٨
هاوڕێی هۆشمەند (عەقڵانی) ........................ ٩٨
هاوڕێی بەسۆز ............................ ٩٩
هاوڕێی ئارەزووباز ............................ ١٠١
هاوڕێی دیدەیی ............................ ١٠٢
هاوڕێی بیستەکیی ............................ ١٠٥
هاوڕێی چالاك و بەهەست ............................ ١٠٨
هاوڕێی کەللەڕەق ............................ ١١١
هاوڕێیەك کە کەسانی دەوروبەری دەکاتە تەوەری ژیانی ......... ١١٣
هاوڕێی خۆنزیککەرەوە لە ئامانجەکان ........................ ١١٤
هاوڕێی خۆبەدوورگر (خۆپارێز) ........................ ١١٦
هاوڕێی خۆلێکچوێنەر ............................ ١١٨
هاوڕێی خۆجیاکەرەوە ............................ ١١٩
هاوڕێی تێکڕابین ............................ ١٢٠
هاوڕێی زۆر وردەکار ............................ ١٢١

هاوڕێی ناچار .................................... ١٢٣
هاوڕێی لەسەرخۆ و هۆشمەند.............................. ١٢٤
سوودێك:................................................ ١٢٦
لە قەفەسی تۆمەتبارکردندا: ناپاکیی هاوڕێیان.............. ١٢٧
پێڕست ................................................ ١٣١